ناوی کتێب: سەیرو سەمەرەکانی شێخانی

بابەت: رۆمان

دانەر: کەمال سەعدی

دیزاینی ناوەرۆک و بەرگ: شاهین نەجمەدین

پیتچنین: دانەر

پێداچوونەوەی رێنووس: سابیر ڕەشید

چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەڕ.

چاپ: چاپی یەکەم، 2023

تیراژ: 500 دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (795) سالّی (2023)ی پێدراوە

مافی لەچاپدانەوەی بۆ نووسەر پارێزراوە.

من (سەعدوڵڵا شێخانی) ڕێگام داوە ڕۆماننووس هەندێک لایەنی سەیرو سەمەرە لە ژیانمدا بنووسێتەوەو بیکاتە ڕۆمان. بۆیە بەشێک لە ڕووداوەکانی ناو ڕۆمانی (سەیر و سەمەرەکانی شێخانی) ڕووداوی ڕاستەقینەن‌و لە زاری خۆم وەری گرتوون‌و تێکەڵ بە خەیاڵی ئەدەبیی خۆی کردوون. نووسەر لەم ڕۆمانەدا پاڵەوانەکەی بەکەسێکی گێلۆکەو ساویلکە وێناکردووە، هەربۆیە سەرەتا ناوی لێ نابوو (سەیر و سەمەرەکانی تەهالۆک شێخانی) بەڵام لەسەر ڕاسپاردەی خۆم ناوەکەی گۆڕی بۆ (سەیر و سەمەرەکانی شێخانی)، تەنانەت داوام لێیکرد ناوی کەسایەتییەکانی ناو ڕۆمانەکەش وەکو خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام بەقسەی نەکردم‌و زۆربەیانی گۆڕی. ئێمە دەمانەوێ بەگێڕانەوەی ئەم ڕووداوە سەیرو سەمەرانە دڵی خەڵک خۆش بکەین‌و بە پێکەنینیان بهێنین، هەر بۆیە ڕۆماننووس ڕووداوەکانی بەتەنز گێڕاوەتەوە.

سەعدوڵڵا شێخانی

هەولێر 2023/8/16

## سەرەتای ناسین

چەند ڕۆژێک بوو شەڕی عێراقو ئێران دەستی پێ کردبوو، بۆ جاری دووەم ناوی سەربازیم هاتەوە، بەهۆی ئەم شەڕە نەگریسە، حکوومەت لاوانی چەند تەمەنێکی کردە سەرباز. فەرمانگەی دامەزراندنی سەربازی لەگەڕەکی تەیراوە بوو، کەچووم خەڵکێکی زۆرم لەوێ بینی، بەڕۆژی پەسلان دەچوو. ئەوانەی دەبوونە سەرباز، بەخەمباری لەبەر دەرگای فەرمانگەی دامەزراندنی سەربازی ڕاوەستابوون، دەفتەری ڕاژەی سەربازییان بەدەستەوەبوو، چاوەڕێی کارمەندی سەربازگرەکەیان دەکرد، تا لێیانو ەربگرێتو ناویان تۆمار بکات.

لەناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا، چاوم بەشێخانی کەوت، بەدەستەکانی خەڵکی لەپێش خۆی لادەدا، هەوڵی دەدا خۆی بگەیەنێتە لای دەرگا .

شێخانی تەمەنی لەمن بچووکتر بوو، سەیرم پێ هات کەلەبەردەمی ئۆفیسی دامەزراندنی سەربازیدا بینیم، پێم گوت: لێرە چی دەکەیت، ناکات بڵێی ناوی سەربازیم هاتووە؟!

گوتی: دوو ساڵ لەسەر یەک لەخوێندن دەرنەچووم، بۆیە لەقوتابخانە دەریان کردمو نووسراوێکییان بۆ کردم بۆ ئێرە بۆ ئەنجامدانی خزمەتی سەربازی زۆرە ملێ.

ئەمەی گوتو خۆی گەیاندە بەر دەرگاو دەفتەری ڕاژەو نووسراوەکەی قوتابخانەی دایە دەست کارمەندی فەرمانگەکەو چاوەڕێی خوێندنەوەی ناوی خۆی کرد .

پاش ئەوەی دەفتەری ڕاژەیان لەئێمەش وەرگرت، دوای هەندێک، کارمەندی فەرمانگەی دامەزراندنی سەربازی هاتەوە لامانو پێی گوتین: ئێوەمان ڕەوانەی بنکەی مەشقی سەربازگەی ئازادی کردووە لەشاری بەغداد، خۆمان نووسراوەکەیان بۆ دەنێرین، ئێوەش بڕۆنە تەرمیناڵو بڕۆنە بەغداد، پەیوەندی بەو بنکە سەربازییە بکەن. ئەوەی نەچێتو دوا بکەوێت سزا دەدرێت .

ئەوەبوو لەگەڵ شێخانی بەیەکەوە چووینە تەرمیناڵ. کۆستەرەکانی هێڵی بەغداد داواکاریی زۆرییان لەسەر بوو، بۆیە شوفێرەکان خۆیان خستبووە سەر پشتو داوای کرێیەکی زۆرییان دەکرد. شێخانی کرێیەکەی پێ زۆر بوو، دەیویست بگەڕێتە ماڵەوەو نەیەت.

پێم گوت: بەهەر نرخێک بێت ناچارین بڕۆین، هەندێکی تر ئەوانی تریش پەڕتووکەکانیان وەردەگرنەوەو دێن، ئەوکات شوفێرەکان خۆیان دەخەنە سەر پشتو داوای کرێیەکی زیاتر دەکەن.

ئەویش گوتی: داوای پارەیەکی زۆر دەکەن، چۆن بیاندەینێ؟ منیش گوتم: دەزانن ناوی سەربازیمان هاتووەو ناچارین لەگەڵیان بڕۆین، بۆیە دوو قاتی هەقی خۆیان داوا دەکەن .

کەوام گوت، ئینجا ڕازی بوو لەگەڵم بێت. سواری کۆستەرێک بووینو بەڕێ کەوتین. بەدرێژایی ڕێگا هەر پرتەو بۆڵەی بوو، لەبەر خۆی دەیگوت (نابێت ئەوەیان لەسەر بچێت، دەبێت تۆڵەیان لێ بکەمەوە.)

کەگەیشتینە شارۆچکەی خورماتوو، لەبەردەم چێشتخانەیەک شوفێرەکە کۆستەرەکەی ڕاگرتو گوتی: پشوێک دەدەینو لەم چێشتخانەیە نانی نیوەڕۆ دەخۆین.

لەکۆستەرەکە دابەزین، لەگەڵ شێخانی بەیەکەوە چووینە چێشتخانەکەو لەپشت مێزێک دانیشتینو داوای برنجو فاسولیاو مریشکمان کرد.

پــاش ئەوەی چێشــتەکەمان خــوارد، بەیەکەوە هەســتاین‌و چوینە لای کاشێر. تـا مـن دەسـتم خسـتەوە گیرفانم‌و پارەم دەرهێنــا، ئەو خــۆی دزیــیەوەو لــووس‌و باریــک ڕۆیشــتە دەرەوەو پارەی خۆی نەدا. منیش پارەی خۆم داو گەڕامەوە نـاو کۆسـتەرەکەو پێم گـوت: بۆچی خـۆت دزییەوەو پارەی خواردنەکەت نەدا؟ گوتی: لەڕقی ئەو شوفێرە سەگبابە پارەم نەدا، پارەی زیادی لێوەرگرتین، منیش تۆڵەی خۆمم کردەوە .

منـیش گـوتم: شـوفێری کۆسـتەرەکە پـارەی زیـادی لـێ‌و ەرگرتی، خاوەنی چێشتخانەکە چ بکات، گوناهی چییە؟

گـوتی: چـۆن گونـاهی نیـیە، ئەدی مـن گونـاهم چیـیە ئەم شوفێرە بێویژدانە پارەی دوو نەفەری لێ وەرگرتم.

# گێلۆکەی میهرەبان

ئێوارە گەیشتینە بنکەی مەشقو ڕاهێنانی سەربازی لەبەغداد، ئەفسەرێک ئێمەی ڕیزکردو ناوەکانی خوێندینەوە. دوای ئەویش فەرماندەی بنکەکە لەگەڵ چەند ئەفسەرێک هاتنە لامانو بەسەر سێ فەسیلی سەربازی دابەشییان کردین .

شێخانی هاتە لای منو گوتی: لەگەڵ تۆ دەبم، لێرە کەس نانانسم، لەهەر فەسیلێکییان دانایت لەگەڵت دەبم.

منیش پێم گوت: لەگەڵ من وەرە، خۆت ون مەکە تالەگەڵ ئێمە ناونووس بکرێیتو لێمان جودا نەبیتەوە.

ئەوەبوو بەسەر سێ فەسیل دابەشییان کردینو بەتانیو باليفو تەشتی چێشتخواردنییان داینێ. منو ئەویان لەیەکدی جودا کردەوە، هەرچەندە فەسیلمان جودا بوو، بەڵام لەیەک هۆڵدا دەخەوتین .

دەبوو بەیانییان زوو لەخەو هەڵبستین، ڕیشمان بتاشینو نانی بەیانی بخۆینو لەگۆڕەپانی مەشق ئامادەبین. شێخانی لەشی زۆر سووک بوو، پێش ئێمە بەیانییان لەخەو هەڵدەستاو یەک دۆلکە شیرو هەندێک سەموونو تەشتێک شۆربای نیسکی بۆ خۆمو خۆی دەهێنا. بەم شێوەیە لەگەڵ شێخانی ڕاهاتم. گەنجێکی قسەخۆشو دەم بەخەندە بوو. وێڕای

ئەوەی سەربازێکی شەپڕێو بوو، بەڵام لەبەر قسەی خۆش‌و ڕەفتارە سەیرو سەمەرەکانی هەموو سەربازەکانی بنکەکە خۆشییان دەویست. تەنانەت ئامری فەسیل‌و عەریف فەسیلیش خۆشیان دەویست‌و چاوییان لەسەرپێچییەکانی دەپۆشی‌و سزایان نەدەدا .

لەکۆتایی حەفتە، هەموو پێنج شەممەیەک دوای تەواوبوونی مەشق دادەبەزین‌و دەگەڕاینەوە شاری هەولێر. تەنها ئەو گێلۆکەیە نەبێت لەگەڵمان نەدەهاتەوەو لەبنکەی سەربازی دەمایەوە .

زۆرم بەلاوە سەیر بوو، بۆچی بەتەنیا دەمێنێتەوەو لەگەڵ ئێمە ناگەڕێتەوە. ئێمە هەموو پێنج شەممەیەک دەگەڕاینەوەو ڕۆژی هەینی دوای نیوەڕۆ دەگەڕاینەوە.

جارێکیان وارێککەوت نەخۆش بووم، نەمتوانی بگەڕێمە ماڵەوە، بۆیە لەگەڵ ئەودا لەسەربازگە مامەوە. ڕۆژی هەینی لەسەر جێگا پاڵ کەوتبووم، کاتی دابەشکردنی چێشتی نیوەڕۆ بوو، ئەویش تەشتەکەی هەڵگرت‌و ڕۆیشت. دوای کەمێک هاتەوە، پڕ بەتەشتەکە گۆشتی هێنابوو. تەشتەکەی لەتەنیشت من داناو گوتی: هەستە نان بخۆ.

کەچاوم بەتەشتی گۆشتەکە کەوت، سەرم سوڕما، پێم گوت: تۆ چیت کردووە، گۆشتی یەک فەسیلی سەربازیت هێناوە، ئێمە دوو کەسین ئەو هەموو گۆشتەمان بۆ چییە؟

گوتی: هەموو جارێک کەئێوە دادەبەزن‌و دەگەڕێنە ماڵەوە، کەلێرە دەمێنمەوە، بەرپرسی چێشتخانەکە پڕ بەو تەشتە گۆشتم بۆ تێدەکات. منیش گۆشتەکە دەخەمە ناو ستلێک‌و لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە هەولێرو هەندێکی بۆ خۆمان دەگێڕمەوە، ئەوەی تریش دەدەمە بێوەژنێکی دراوسێمان کەدوو منداڵی هەتیوی هەیەو کەم دەرامەتە.

کەوای گوت، زۆر سەیرم پێ هات، لەبیری خۆمدا گوتم (چۆن بەدانێک فریا دەکەوێت بگەڕێتەوە هەولێرو هەمان ڕۆیش بگەڕێتەوە بەغداد.)

ئەمەو پارچە گۆشتێکی خستە ناو سەموونێک‌و خواردی‌و گۆشتەکەی تریشی خستە ناو ستلێک‌و خوا حافیزی لێ کردم.

کەئەم دیمەنەم بینی، لەبیری خۆمدا گوتم (بەخۆڕایی نەیانگوتووە دنیا بەهەشتی گێلانە، ئەو شێخانیە هەرچەندە کەسێکی گێلۆکەیە، بەڵام لەزۆر کەسی ئاقڵ باشترە، دڵێکی گەورەی هەیە، قوربانی بەپشووی خۆی دەدات، تاکو دڵی دایکە هەتیوێک خۆش بکات‌و یارمەتییان بدات).

# دنیا بەهەشتی گێلانە

مــاوەی مانــگو نیوێــک لەگەڵ ئەو مــامەوە، ئێــوارەیەک پێکەوە لەکافتریـای بـنکەی سـەربازی دانیشـتبووین چایەمـان دەخـواردەوە، عەریفێکـی عەرەبـی ڕەشپێسـتی بـاڵابەرز هـاتە ژوورەوە، کەچـــاوی بەشـــێخانی کەوت، ســـەری ســـوڕما، بەتوڕەییەوە پێی گوت: کوڕی سـەگ، مـاوەیەکی زۆرە دەوام ناکەیت، داخیلی هروب بوویت، لێرە چی دەکەیت؟!

گێلۆ عەرەبی باش نەدەزانی، تێنەگەیشت چی دەڵێ؟

عەریفەکە لێمان نزیک بۆوەو دەسـتی بـۆ سـەری درێژکـردو بێرییەکەی لەسـەری کردەوەو بەتوندی بەسـینگی داداو گوتی: لەگەڵ تۆمە، بۆچی وەڵام نادەیتەوە؟

شـێخانیش ڕووی لەمـن کـرد گـوتی: ئەوە چـی دەڵـێ، بـۆچی وەها توڕەیە؟

منـیش گـوتم: دەڵـێ مـاوەیەکی زۆرە دەوامـت نەکـردووەو داخیلی هروب بوویت.

ئەویش گوتی: پێی بڵێ هەموو ڕۆژێک دەوامم کردووە، ئەی لەگەڵ ئێوە دەوامم نەکردووە؟

منیش قسەم لەگەڵ عەریفەکە کردو بەعەرەبی پێم گوت: شێخانی هیچ غائیب نەبووە، دەوامی خۆی بەڕێکو پێکی کردووە، لەگەڵ من لەهۆڵێکەو لەتەنیشت یەک دەخەوین.

کەوام پێ گوت، سەری خۆی لەقاندو بەتوڕەییەوە گوتی: ئەم گاڵتە جاڕییە چییە، بۆچی سەربازیی قەشمەرییە، کوێی بوێ لەوێ دەوام بکات!

شێخانی سەری لەتوڕەیی ئەو عەریفە سوڕمابوو، گوتی: ئەوە چی دەڵێ؟

قسەکانی عەریفەکەم بۆی کردە کوردیو پێم گوت: لەقسەکانی ئەو عەریفە دیارە لێک حاڵی نەبوونێک لەنێوانتاندا هەیە.

ئەویش گوتی: چی لەمن دەوێ، لەناو ئەو هەموو سەربازەدا بۆچی تەنها یەخەی منی گرتووە؟

منیش ڕووم لەعەریفەکە کردو پێم گوت: بۆم ڕوون بکەوە، مەبەستت چییە دەڵێی دەوامی نەکردووە؟

گوتی: کەهاتنە ئەم بنکەیە ماوەیەک گشت سەربازەکانی ئەم فەوجە بەیەکەوە بوون، وایە؟

گوتم: ئەوە دەزانم.

گــوتی: بەڵام دواتــر دابەش کــران بــۆ ســێ ســریەو هەر سریەیەکیش بۆ سێ فەسیڵ، ناوی ئەو سەربازە لەسریەی دوو فەسیلی یەک گەڕاوەتەوە، کەچی لەو ڕۆژەوە کەبەسەر ئەو یەکە نوێیانەدا دابەش بوونە، دەوامی نەکردووە، دەبێ بگیرێت.

کەقسەکانی عەریفەکەم بۆی کردە کوردی، گوتی: پێی بڵێ جیاوازی چییە لەهەر کوێیەک دەوام بکەم، بۆچی سەربازی هەمووی یەک نییە؟

عەریفەکەش ڕووی لەمن کردو گوتی: ئەوە چی دەڵێ؟

کەقسەکانیم بۆ کردە عەرەبی، بەسەر سوڕمانەوە گوتی: هەر لەو کەرەمان کەم بوو، پێم ناڵێی ئەوە گێلە یان خۆی گێل دەگات؟!

منیش پێم گوت: ئەگەر گێل نەبێت، کەس هەیە ڕۆژانی پێنج شەممە دوای تەواوبوونی مەشق دانەبەزێتو نەگەڕێتەوە ناو خانەوادەکەی؟!

ئەویش گوتی: بۆچی ئەو پێنج شەمووان دانابەزێت، لەبنکەی سەربازی دەمینێتەوە؟

پێم گوت: نەک ئەوەندە، بەڵکو ڕۆژی هەینی لەجیاتی هەموومان گۆشت وەردەگرێتو دەیخاتە ناو سەتڵێکو

لەگەڵ خـۆی دەیبـاتەوە هەولێـر، دەیـداتە بێـوەژنێکی دایـکە هەتیوی کەم دەرامەت.

کەوام پـێ گـوت، بەزەیـی پێدا هـاتەوەو گـوتی: بـاش بـوو ئەوەم زانـــی، بەڕاســـتی ئەوە گـــێلەو کۆمەڵێـــک تەخـــتەی نوقوســتانە، دەنـا چـۆن وا دەکـات، پێـی بڵـێ لەگەڵ تـۆ لێـرە چاوەڕێم بکـات، دەچمە لای ئـامری سـریەو تێی دەگەیەنـم، تـا بیبەخشێت، ئینجا دیمەوە لاتان‌و لەگەڵ خۆم دەیبەم.

ئەمەی گوت‌و ڕۆیشت. شێخانی کەدیتی عەریفەکە ڕۆیشـت، گوتی: ئۆخەی لەکۆڵم بۆوە، چیرەی چەند درێژ بوو، دەیویست بەزۆری لەگەڵ خۆی بمبات‌و لەیەکتریمات جودا بکاتەوە.

لەدڵی خۆمدا گوتم: (چۆن ئەو گێلۆیە تـێ بگەیەنـم کەنیزامـی سەربازی فشە نییە، کوێی بـوێ بەئـارەزووی خـۆی لێـی دەوام بکات). من لەو بیرکردنەوەدا بووم پێـی گـوتم: بـۆچی قسـەیەک ناکەیت، ئەو سەگبابە چی لەمن دەویست؟

منـیش پێم گـوت: ئەگەر ئەو عەریـفە کەسـێکی خـراپ بـوایە، تـۆی دەگـرت، چـونکە نـاوت لای ئەو بەنەهـاتوو تۆمـار کـراوەو بەڕاکردوو لەسەربازی دانراوی.!

کەوام پێـی گـوت، تۆزێـک بیـری کـردەوە ئینجـا گـوتی: تـا نەهاتۆتەوە با لێرە بڕۆین.

منیش گوتم: بۆ کوێ دەڕۆیت، تازە زانی کەلەگەڵ منیت، بەئاسانی دەتدۆزێتەوە. با چاوەڕێ بکەین بزانین چیت بۆ دەکات.

کەوام پێی گوت، بەتوڕەیی هەستا، هەر قاچێکی کردە دوانو بەڕاکردن ڕۆیشتە دەرەوە. منیش لەدوای ئەو هەستام. تامن چوومە دەرەوە، ئەو لەو ناوە نەمابوو، لەبەر چاو ون ببوو. زۆر چاوم گێڕا، لەهیچ شوێنێک نەمدۆزییەوە. گەڕامەوە هۆڵی خەوتن، لەوێش نەبوو. زۆر لەخەمی دابووم، لەدڵی خۆمدا دەمگوت (تۆ بڵێی چی بەسەر هاتبێت.)

عەریف فەسیلەکەمان سافیرەی لێدا، گوتی: کاتی ژەمی ئێوارەیە، تەشتی نانخواردن ببەن، چێشت ئامادەیە وەری بگرن.

پێشتر لەبەر شێخانی خەمی وەرگرتنی چێشتمان نەبوو، بەبێ پێ گوتن ئەو بۆی دەهێناین، بەڵام ئەم ئێوارەیە ناچار بووم تەشتەکە دەست دەمێو خۆم بچمە چێشتخانەو بۆ خواردن سەرە بگرم. بەهەرحاڵ، چێشتەکەم وەرگرتو گەڕامەوەو بەتەنیا خواردم.

دوای پشوێکی کورت، جارێکی تر عەریف فەسیل هاتە ژوورەوەو سافیرەی لێداو گوتی: خێراکەن جلەکانتان بپۆشنو

پۆستاڵەکانتان لەپێ بکەن‌و لەبەر دەرگای هۆڵەکە ڕیزبن بۆ سەرژمێریی شەوانە.

خۆم گۆڕی‌و چوومە دەرەوە، زۆر چاوم گێڕا، شێخانیم نەبینی، لەسەربازەکانم پرسی شێخانیتان نەبینیوە؟

یەکێک لەسەربازەکان گوتی: ئێوارە بینیم، بەرەو لای سیمی سەربازگە ڕای دەکرد. کەگەیشتە سیمەکە، پێی هەڵگەڕاو ئاو دیو بوو.

منیش گوتم: تۆ دڵنیایت کەئەو بوو؟

گوتی: دڵنیام ئەو بوو، تەنانەت بانگیشم کرد، بەڵام وەڵامی نەدامەوە.

ڕۆیشتنی شێخانی بۆشاییکی گەورەی لەدوای خۆی بەجێهێشت، جیگەی زۆر دیار بوو، تا لەگەڵمان بوو، خەمی خواردنی بەیانیان‌و چێشتی نیوەڕۆو ئێوارانمان نەبوو. بەبێ ئەوەی پێمان بگوتبا بۆی دەهێناین. بەڵام پاش ئەوەی ڕایکردو ئێمەی بەجێهێشت، زۆرجار فریای هێنانی خواردنی بەیانیان نەدەکەوتین‌و بەسکی برسی دەچووینە گۆڕەپانی مەشق‌و ڕاهێنان.

## جاشایەتی و پاشایەتی

پاش ئەوەی شێخانی لەسەربازی ڕایکرد، ڕۆژێک بەڕێکەوت عەریف فەسیلەکەیانم بینی گوتی: وەزارەتی بەرگری لێبووردنی گشتی بۆ سەربازە سەرپێچیکەرو ڕاکردووەکان دەرکردووە، ئەگەر ماڵی شێخانی پێ دەزانیت، هەواڵی بۆ بنێرە با بگەڕێتەوە.

کەوای گوت، زۆرم پێ خۆش بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم (لەوەتی ئەو ڕایکردووە، کەس نییە خواردنی بەیانیانمان بۆ بێنێ، ئەگەر ئەو بێتەوە، خواردنی بەیانانیشمان لەکوڵ دەبێتەوەو بەقسە خۆشەکانیشی خەمو پەژارەمان دەڕەوێتەوە کاتمان زوو لێ دەڕوات).

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، عەریف فەسیلەکە لێی دووبارە کردمەوەو گوتی: لەبیر نەکەیت، ڕۆژی پێنج شەممە کەدابەزیت، سەردانی بکەو پێی بڵێ کەهیچی بۆ نابێت، با بگەڕێتەوە.

منیش گوتم: تۆ دڵنیایت لەوەی ئەگەر بگەڕێتەوە، ناگیرێتو سزا نادرێت؟

گوتی: بۆ دڵنیابوون لەگەڵم وەرە، دەچینە قەڵەمی سریەو خۆت نووسراوەکە ببینە.

کەوای گوت، دڵنیابووم کەدرۆم لەگەڵ ناکات، بۆیە بەڵێنم پێی دا کەلەگەڕانەوەمدا، سەردانی بکەمو ئەم هەواڵەی پێ بگەیەنم.

لەڕاستیدا ناونیشانیماڵیانم پێ نەدەزانی، ژمارەی تەلەفۆنی ئەویشم لا نەبوو، بەڵام دەمزانی کەخاڵێکی سەرۆک جاشەو بارەگای فەوجەکەی لەگەڕەکی مەنتکاوەیە. بۆیە کەگەڕامەوە، بەر لەوەی بچمە ماڵەوە، چومە گەڕەکی مەنتکاوە، بەو نیازەی لەڕێگای خاڵییەوە هەواڵی لێبووردنە گشتییەکەو ڕاسپاردەی عەریف فەسیلەکەی پێ بگەیەنم.

کەگەیشتمە بارەگای فەوجی خاڵەکەی، هەندێک پاسەوانی چەکدارم لەبەر دەرگا بینی، خۆم پێ ناساندن گوتم: من هاوڕێی سەربازیی شێخانیم، دەمەوێ چاوم بەخاڵی ئەو بکەوێت، ڕاسپاردەیەکم بۆ ئەو پێیەو دەمەوێ ناونیشانی ئەوی لێ وەرگرمو سەردانی بکەم.

پاسەوانەکە گوتی: شێخانی خۆی لای خاڵی ناونووس کردووەو بەرپرسی ئازووقەیە، ئەگەر دەتەوێ بیبینی کەسێکت لەگەڵ دەنێرم بتباتە لای بەرپرسی کارگێڕی فەوج بۆ ئەوەی تەلەفۆنی بۆ بکات.

کەچووم، عەریف فەسیل نەوزاد مێبازم بینی. پاسەوانەکە ڕووی تێ کردو گوتی: ئەم برادەرە شێخانیی دەوێت.

منو نەوزاد مێباز یەکدیمان دەناسی. ئەو پێشتر لەبازاڕی فەرهاد لەبەرامبەر دەرگای قەیسەری دوکانی ڤیدیۆی هەبوو، زۆرجار ڤیدیۆو فلیمی هیندیم بەکرێ لێ وەردەگرت. لەناو دوکانەکەی پەنایەکی بەپەردە دروستکردبوو، بەردەوام ژنی دۆمو لەشفرۆشی تێدا دەگا، هەربۆیە دوکاندارەکانی بازاڕی فەرهاد بەنەوزاد مێباز ناوزەدییان کردبوو، بۆ ئەوەی لەنەوزادەکانی تر جودا بکرێتەوە کەلەو بازاڕەدا دوکانییان هەبوو.

نەوزاد مێباز کەچاوی پێم کەوت، باوەشی پێدا کردمو وای زانی منیش هاتووم لەجیاتی سەربازی ببمە جاشو خۆم ناونووس بکەم، گوتی: ناکات تۆش لەسەربازی ڕات کردبێت؟

منیش گوتم: جارێ ڕام نەکردووە، کەی فەوجەکەمان چووە بەرەکانی جەنگ، ئەوکاتە منیش ڕادەکەم، بەڵام نابمە جاش، دەچمە گوندێکی دوورە دەستی دەرەوەی شارو لەوێ دەمێنمەوە تا ئەم جەنگە نەگریسە کۆتایی دێت، ئەوکات دەگەڕێمەوە.

ئەویش گوتی: منیش نەبوومەتە جاش، بەڵکو خزمەتی سەربازیم گواستۆتەوە بۆ ئەم فەوجە.

منیش گوتم: بۆچی پێشتر لەکوێ بوویت؟

گوتی: کەبوومە سەرباز، بەشداری خولی عەریف فەسیلەکانم کردو دوای تەواو کردنی خول، لەبنکەی مەشق‌و ڕاهێنانی سەربازی دیوانییە بوومە مامۆستای مەشق‌و ڕاهێنان. شوێنەکەم زۆر خۆش بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی وەزارەتی بەرگری بڕیاریدا ئەو کەسانەی لەسەر گەوادی‌و قوندەری لەخزمەتی سەربازی بەخشراون، بگەڕێنەوە سەربازی‌و دوای مەشق ڕەوانەی بەرەکانی جەنگییان بکەن. ئیتر ئەوەبوو بەحوکمی ئەوەی فەرماندەی بنکە سەربازییەکەمان منی دەناسی‌و دەیزانی پێشتر دوکانی ڤیدیۆم هەبووەو زۆرجاریش فلیمی پۆڕنۆم بۆ دەبردو ئیجازەی دەدامێ، بۆیە لەدووی ناردمو گوتی: ئەم جەنگە درێژەی خایاند، قوربانییێکی زۆرمان داوەو کوشتارمان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبێت، چەند گەوادو قوندەریش هەن، لەجیاتی ئەوەی چەک هەڵبگرن‌و بچنە بەرەکانی جەنگ، بەرگری لەگەڵ‌و نیشتمان بکەن، لەعەفەج‌و سەحاجی‌و گەڕەکی کەمالییە لەشاری بەغداو شوێنەکانی تر خەریکی ژن بەگاندان‌و قوندانن. ئێستا ئەوان

بەبڕیاری وەزارەتی بەرگری لێرە کۆکراونەتەوەو مەشقی سەربازییان پێ دەکرێتو دواییش ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ دەکرێن، ئەو گەوادو قوندەرانە بکوژرێن باشترە لەوەی سەربازێکی شەریف شەهید بکرێتو ئەوانیش بەئاسوودەیی لەماڵی خۆیان دابنیشنو خەریکی گەوادیو قوندان بن.

نەوزاد مێباز بەردەوام بوو لەگێڕانەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: خۆزگەم بەو ڕۆژی، شوێنم زۆر خۆش بوو، چەند گەوادو قوندەر هەن کەناوی سەربازییان هاتبوو، دران بەمنو فەرماندەی بنکەکەمان گوتی: پێش هەموو شتێک بیانخە ناو قوڕاو، تادوو کاتژمێر لەناو قوڕاو گێرەیان پێ بکە تا لێڕابێنو نرخی ژیانێکی بەشەرەفمەندیی بزانن.

منیش گوتم: چ خۆشییەکی تێدایە مەشقو ڕاهێنان بەقوندەرو گەوادان بکەیت؟

گوتی: پارووم کەوتبووە ناو ڕوون، یەکەم ڕۆژ دە کەسم لەو گەوادانە جودا کردەوە، ئەوانەی کەسەرۆک عەشیرەتو گەورەی ئەوان بوون، لەگەڵیان ڕێک کەوتم، ئەگەر ئاگایان لێم بێت، منیش ئاگام لەوان دەبێت. ئەوەبوو، لەشاری دیوانییە لەهوتێلێکی باش ژووریکییان بۆ گرتمو لەوێ دەخەوتم.

ڕۆژانەش ژنی لەشفرۆشی جوانیان بۆ دەهێنام، تا بەیانی لەگەڵم ڕادەبواردن.

منیش گوتم: مادام لەوێ ئاسوودە بوویت بۆچی هاتیتە ئێرە؟

گوتی: پاش ئەوەی ماوەی مەشقپێکردنیان تەواو بوو، منیشیان لەگەڵ ئەوان گواستەوە بۆ بەرەکانی جەنگ، بەڵام نەچووم، داوام لەم سەرۆک جاشە کرد ڕامکێشێتە لای خۆی، لەو کاتەوە تاکو ئێستا لەجیاتی سەربازی لێرە دەوام دەکەم.

ئێمە لەم قسانەدا بووین، شێخانیم بینی، دەفتەرێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، لەبارەگای فەوج دەهاتە دەرەوە، کەچاوی بەمن کەوت، لەخۆشییان دەفتەرەکەی فڕێداو باوەشی پێدا کردمو منی ماچ کرد. لەخۆشییان چاوەکانی پڕ ئاو بوون، گوتی: دەزانی چەند بیری ئێوەم کردووە؟

منیش گوتم: ئێمەش زۆر بیری تۆمان کردووە، عەریف فەسیلەکەتان پێی گوتم (وەزیری بەرگری لێبووردنی گشتی بۆ سەربازە سەرپێچیکەرو ڕاکردووەکان دەرکردووە)، داوای لێ کردم کەسەردانت بکەمو ئەم هەواڵەت پێ بڵێمو لەگەڵ ئێمە بگەڕێیتەوە.

کەوام گوت، بەپێکەنینەوە گوتی: من کەربووم کەپەیوەندیم بەسەربازییەوە کرد، ئێستا ناوی خۆم لای خاڵم نووسیوەو بەرپرسی ئازوقەی فەوجەکەم، ئازوقە بۆ سەنگەرەکانی فەوجەکەمان دەبەم، لەوە زیاتر هیچ کارێکی تر ناکەم.

منیش بەپێکەنینەوە پێم گوت: ئەگەر تۆ نەگەڕێیتەوە کێ بەیانیان شۆربای نیسکو چایەمان بۆ بێنێ. هەروەها کێ ڕۆژانی هەینی گۆشتی چێشتخانەکە وەربگرێتو بەسەر هەژاراندا دابەشی بکات؟

ئەویش گوتی: لێرە خۆم بەرپرسی ئازوقەم، گشت ئازوقەی ئەم فەوجە لەژێر دەستی منە، بێ لەسەنگەرەکانی پێشەوە، بەسەر ماڵە هەژارەکانیش دابەشی دەکەم.

ئەمەی گوتو دەفتەرەکەی دایە دەستمو گوتی: سەیری ئەم دەفتەرە بکە، ناوی نزیکەی هەزار سەربازی تیایە، زۆربەیان بن دیوارنو دەوام ناکەن.

منیش گوتم: بۆچی دەوام ناکەن، ناترسێن سزا بدرێن؟

گوتی: ئەوانە لەترسی سەربازی لای خاڵم خۆیان ناونووس کردووە.

دەفتەرەکەم لێی وەرگرتو تەماشایەکی ناوەکانم کرد، ناوی چەند هونەرمەندو نووسەرو پارێزەرێکم بەرچاو کەوت، گوتم:

ئەم نووسەرو هونەرمەندانەی کەناویان لەناو ئەم دەفتەرە دایە، دەوام دەکەن؟

گوتی: خالْم زۆر ڕێزیان لێ دەگرێت، حەیرانبێژێک هەیە کەلاسایی ڕەسوول گەردی دەکاتەوە، ئەویش لەترسی سەربازی ناوی خۆی لای خالْم تۆمار کردووە. کەمیوانێکی تایبەتی بێت، لەدوای دەنێرێت، داوای لێ دەکات حەیرانییان بۆ بلێت.

دەفتەرەکەم دایەوە دەستیو پێم گوت: بەگوێرەی قسەکانی تۆ بێت، لێرە زۆر ئاسوودەیتو بەنیاز نیت جارێکی تر بگەڕێیتەوە سەربازی؟

گوتی: بۆچی تۆش لێرە نامێنیتەوە، بەخالْم دەڵێم ناوی تۆش لای خۆی تۆمار بکات.

منیش گوتم: تا لەبەغدا بین ڕاناکەم، کەی ئێمەیان بۆ بەرەکانی جەنگ گواستەوە، ئەوکات ڕادەکەم.

ئەویش گوتی: کەڕات کرد، ئاگادارم بکەوە، تاناوت تۆمار بکەم.

منیش گوتم: ئەگەر لەسەربازیش ڕابکەم، نابمە جاش، دەچمە ماڵی خالۆوانمو لەگوند خۆم دەشارمەوە.

ئەویش گوتی: دەتوانی چەک هەڵنەگریتو دەوام نەکەیت، وەکو ئەوانی تر بن دیواربە.

منیش گوتم: لەبەر هیچم نییە، دەزانم ئێوە ئاسوودەن لەبەر خاتری من وا دەڵێی، بەلاش نەیانگوتووە جاشایەتیو پاشایەتی، بەڵام ئەوە بۆ من دەست نادات، کەسێکی دیارم، مردنم پێ باشترە نەک ببمە جاش.

ئەویش گوتی: بەچاوی خۆت بینیت چەندین هونەرمەندو نووسەر لای خالّم خۆیان تۆمار کردووەو پێشیان شەرم نییە. تەنانەت هەندێکیان لەدیوەخانی خالّمدا مۆسیقا دەژەنن و گۆرانی بۆ میوانەکان دەڵێن.

منیش گوتم: هەر کەسێک بەجۆرێک بیر دەکاتەوە، لەوانەیە ئەوان ڕاست بنو من هەڵەبم، ئەنجام شەرتە، جاشی باشیش هەیەو باشی جاشیش هەیە. بۆ نموونە تۆ یەکێکی لەو پیاوە دڵ سافو باشانە.

# ئازوقە

ئێـوارەیەک لەچایخـانەی عەبـۆ دانیشـتبووم، چـاوم بەو حەیـران بێـژە کەوت کەلەفەوجـی خـاڵی شـێخانی لەترسـی سـەربازی نـاوی خـۆی تۆمـار کردبـوو، پـێم گـوت: ئاگـات لەشێخانی نییە؟

بەپێکەنینەوە گوتی: گێلۆ شێخانی ؟

منیش گوتم: بۆچی وای پێ دەڵێی؟

ئەویش گوتی: ڕۆژ نییە پۆرتێک نەشکێنێ، خۆت دەزانیت مـن لەبـاوکم حەیـران گـوتنم بـۆ مـاوەتەوە، ئەوجـا ڕەسـول گەردیش دانم پێدا نانێتو دەڵێ: (هەتیم تا من مابم نابێت کەس حەیران بڵێت)، کەچی ئەو گێلە خۆی کردۆتە حەیران بێژو هەر شیرە شیرییەتی.

منیش گوتم: تۆ لەوە بگەڕێ، پێم نـاڵێی چـی وای لـێ کـردی ببیتە جاش؟

گـوتی: لەترسـی سـەربازی نەبێـت، مـنو جاشـایەتی کوجـا مەرحەبـا، لەناچـاری نـاوی خـۆم لای خـاڵی نووسـیوە. لەو ڕۆژانە منو دوو لەپیاوەکانی خاڵی لەگەڵ خۆی برد، هەندێک ئازوقەو خۆراکی لەنـاو پێکابێک بـار کردبوو، گوتی: (دەتبەمە مەفتەنـی حەیـران، تـا نەچیتە بنـاری چیـای قەرەچـوغ، نازانیت

حەیران چییە). کەگەیشتینە دەشتی قەراجو کەندیناوەو لەچیای قەرەچوغ نزیک بووینەوە، داوای لێ کردم حەیرانی بۆ بڵێم. کەچاوم بەدەشتی کاکی بەکاکی قەراجو کەندیناوە کەوت، لەخۆشی دیمەنە جوانەکانی مەستو حەیران بووم. دەستم خستەوە بن گویمو تا گەیشتینە سەنگەرەکانی پێشەوە، حەیرانم گوت. ئەویش ناوە ناوە بەدەنگە ناخۆشو زبرەکەی لەدوای دەگوتمەوە. کاتێک لەسەنگەرەکان نزیک بووینەوە، لەهەموو لایەک کەوتینە بەر ڕێژنەی گوللە. خودا بەزەیی بەمناڵەکانمان هاتەوە کەنەکوژراین. شوفێرەکە پیکابەکەی ڕاگرتو دەستی بەرز کردەوەو بەدەنگێکی بەرز گوتی: ئێمە نەهاتووین شەڕتان لەگەڵ بکەین، ئازوقەو خۆراکمان بۆتان هێناوە. کەئەمەی گوت، چەکدارەکان تەقەیان ڕاگرت. دوو گەنج لەپشت تەڕاشەکان بەرەو لامان هاتن. یەکێکییان کلاشینکۆفێکی سەمینۆفی پێ بوو، ئەوەکەی تریش ئارپیجییەکی لەسەر شان بوو. ئەو گەنجەی کلاشینکۆفەکەی پێ بوو، گوتی: لەپیکابەکە وەرنە خوارەوەو دەستتان بەرز بکەنەوەو لەشوێنی خۆتان نەجووڵێن. ئێمەش هاتینە خوارەوەو دەستمان بەرز کردەوەو وەک بتو سەنەم لەشوێنی خۆمان چەقین .

منیش گوتم: شێخانی چی کرد؟

گوتی: چی بکات، ئەویش لەگەڵ ئێمە دەستەکانی بەرز کردنەوەو لەترسان وەکو کێچ دەلەرزی، دەمی تەتەڵەی دەکرد، نەیدەزانی چی بڵێت.

منیش گوتم: ئەو چەکدارانە کێ بوون کەچەکییان لێ ڕاکێشانو تەقەیان لێ کردن؟

گوتی: پێشمەرگە بوون.

منیش گوتم: پێشمەرگە لەناو سەنگەرەکانی ئێوە چی دەکرد؟

گوتی: ئەو گێلە ملی لەو ئاقارە نابوو، بێ ئەوەی بپرسێت. وامزانی شارەزایە، لەگەڵی ڕۆیشتم، ئەگەر دەمزانی ئەو گێلە پێشمەرگەو جاش لەیەکتری جودا ناکاتەوە، چۆن لەگەڵی دەڕۆیشتم!

منیش گوتم: بۆچی لەدوورەوە ئەوانتان لێ دیار نەبوو؟

گوتی: پێش ئەوەی بگەینە سەنگەرەکانی پێشەوە، یەکێک لەو چەکدارانەی کەلەگەڵمان بوو، بەدووربین تەماشای پێشەوەی کرد، بەشێخانی گوت: سەنگەرەکانمان گیراون، بازیاتر نەچینە پێشەوەو بگەڕێنەوە. شێخانیش گوێی

بەقسەکانی نەداو  بەشوفێرەکەی گوت: لێخوڕەو گوێی مەدێ، پێشمەرگە لەو ئاقارە چی دەکات .

منیش گوتم: ئەدی ئازوقەکەتان چی لێ کرد؟

گوتی: چاک بوو شێخانی کەمێک مێشکی ئیشی کرد، بەپێشمەرگەکانی گوت: ئازوقەمان بۆتان هێناوە. پێشمەرگەکانیش ئازوقەکەیان هێنا خوارەوەو بەپێکەنینەوە گوتییان: حکومەت پیاوی وەکو ئێوەی هەبێت، لەهیچمان کەم نابێت. ئەمەیان گوتو ئێمەیان چەک کرد.

شیرین‌و فەرهاد

ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێیەکم چووینە باڕی سەنابل، ویستمان یەک دوو پێک بیرە بخۆینەوەو سەری خۆمان گەرم بکەین. لەمێزەکەی تەنیشتمان شێخانی‌و وەلید جووتیارو حامد زامدار دانیشتبوون، لەولاتریش دێهاتی‌و سمە سوور دانیشتبوون‌و ئارەقییان دەخواردەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت، من مەشروب خۆر نەبووم، بەڵام جاروبار بۆ دڵخۆشی برادەران دەچووینە ئەو باڕەو یەک دوو پێک بیرەی (فەریدە)مان دەخواردەوە. مەیگێڕەکە چووە لای شێخانی‌و پێی گوت: چیتان بۆ بێنم؟

ئەویش پێی گوت: یەک سندووق بیرەی فەریدەمان بۆ بێنە.

شاگردەکە سەری سوڕما، لێی دووبارە کردەوەو گوتی: تێنەگەیشتم، چەند بتڵ بیرەتان بۆ بێنم.

ئەویش گوتی: جارێ یەک سندووقمان بۆ بێنە، کەتەواو بووین سندووقێکی تریشمان بۆ بێنەوە.

مەیگێڕەکە حەپەسا، سەری خۆی لەقاندو هیچ قسەی نەکرد. هاتە لای ئێمەو گوتی: ئێوە چی دەخۆنەوە بۆتان بێنم؟

گوتم: دوو بتڵ بیرەی فەریدەش بۆ ئێمە بێنە .

کەوام پێی گوت، لەبەر دەم خۆیەوە پێکەنی‌و هیچ دەنگی نەکرد. منیش پێم گوت: بەچی پێ دەکەنی؟

ئیشارەتی بۆ شێخانیکردو گوتی: ئەوانە دەبینن، بەسێ کەس داوای یەک سندووق بیرەیان کردووەو دەشڵێن کەتەواو بوو سندووقێکی تریشمان بۆ بێنەوە .

منیش گوتم: گوێم لێ بوو کەوایان گوت، چۆن ئەم هەموو بیرەیان پێ دەخورێتەوە؟

مەیگێڕەکەش گوتی: زۆرن ئەوانەی زۆر دەخۆنەوە، بەڵام ئەمە یەکەمین جارە ببینم بەجارێک داوای یەک سندووق بیرە بکەن.

ئەمەی گوتو ڕۆیشت، سندووقێک بیرەی بۆ ئەوان بردو دوو بتڵ بیرەشی بۆ ئێمە هێنا.

شێخانی ڕووی لەوەلید جووتیار کردو پێی گوت: خارە جووتیار ئەوجا تا پێت دەخورێتەوە بیرە بخۆوەو بەدەم خواردنەوەشەوە داستانی شیرینو فەرهادم بۆ بگێڕەوە. وەلید جووتیاریش گوتی: ئەم داستانە زۆر درێژە، بەڕۆژێکو دووان تەواو نابێت.

شێخانیش گوتی: ئەجا چییە، تا تەواو دەبێت هەموو ڕۆژێک دێینەوە ئێرە، حامد زامداریش لەگەڵ خۆمان دێنین.

ئەویش گوتی: ئەگەر پێت باش بێت، کەلێرە هەستاین، دەچینە چێشتخانەی یوسف، چێشتی نیوەڕۆ لەوێ دەخۆینو

ئێوارەش دەچینە یانەی ڕاگەیاندنو لەوێ بەشێکی تری داستانەکەت بۆ دەگێڕمەوەو بەم شێوەیە تا داستانەکە تەواو دەبێ، ئێمەش لەگەڵی بەردەوام دەبین.

شێخانیش گوتی: من هیچ ئیشو کارم نییە، ئێوە چۆنتان پێ باش بێت، باوابێت .

وەلید جووتیار ئەوەندەی سەرقاڵی خواردنەوەی بیرە بوو، هێندە پەرۆشی گێڕانەوەی داستانەکە نەبوو. داستانەکەی بەشێوەیەکی وەها دەگێڕایەوە، دەتگوت فلیمی سینەمایە کاتێک خاو دەکرێتەوەو دیمەنەکانی لەسەرەخۆ ڕەت دەبن. لەدڵی خۆمدا گوتم: (دەڵێی چیرۆکی هەزارو یەک شەوەی بۆ دەگێڕێتەوە،و ەها لەسەرەخۆو بەسستی بۆی دەگێڕێتەوە)

لەقسەکانی وەلید جووتیار دیار بوو، دەیویست بەبیانووی گێڕانەوەی داستانی شیرینو فەرهاد بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەسەر حسێبی شێخانی بەخۆڕایی بخواتو بخواتەوە.

شێخانیش لەچاوەکانیدا دیار بوو، ئاشق بوو، بەعیشقەوە گوێی لەداستانەکە گرتبوو، چاوەکانی بڕی بوونە وەلید جووتیارو لەگەڵ هاتنە دەرەوەی هەر وشەیەک لەدەمیدا لەخۆشییان موچڕک بەلەشیدا دەهات، خەیاڵی لای شیرینو فەرهاد بوو.

پاش ئەوەی حامد زامدار شەش بتڵ بیرەی خواردەوە، سەری گەرم بوو، دەستی خستە ژێر گوێچکەکانیو گۆرانی (فاتیمە)ی عەلی مەردانی گوت.

دێهاتیو سمە سووریش بەدووان سندووقێک بیرەیان خواردەوە، ویستیان بڕۆن، شێخانی پێی گوتن: ڕاست بڕۆن، پارەکەتان دراوە.

ئەو برادەرەی کەلەگەڵم بوو، زۆری مەراق بوو بزانێت ئەنجامی داستانەکە بەچی دەگات، ئایا شیرینو فەرهاد بەیەکتری شاد دەبن، یانیش وەکو چیرۆکەکانی تری خۆشەویستیو سۆزداری مەمو زینو لەیلاو مەجنوون، کۆتاییەکەی تراژیدی دەبێت، بۆیە ڕووی تێ کردمو گوتی: ئەگەر ئەم چیرۆکەت پێشتر گوێ لێ بووە، دەتوانی بۆم بگێڕیتەوە؟

منیش گوتم: وا دەزانم دوێنێیە، کەداپیرم ئەم چیرۆکەی بۆم دەگێڕایەوە، تاکو ئێستاش دیمەنەکانیم لەپێش چاوە.

ئەویش گوتی: کەواتە واز لەو برادەرانە بێنەو خۆتییان پێوە سەرقاڵ مەکە، ئەوەندەی لەبیرت ماوە بۆم بگێڕەوە، زۆرم مەراقە بزانم کۆتاییەکەی بەچی دەگات.

منیش گوتم: ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ شاری کرماشان، لەڕۆژهەلاتی کوردستان. شیرین کچێکی شۆخو شەنگو بەرِچەلەک ئەرمەنی دەبێت، خوسرەو پاشای ساسانییەکان زۆری خۆش دەویست، بەلام پێی نەدەگەیشت، چونکە شیرین کەوتبووە داوی خۆشەویستی کەسێکی تر کەئەندازیارو پەیکەر سازێکی زیرەکو بلیمەت بوو، ناوی فەرهاد بوو. بۆ یەکەم جار سالی 1996 کاتێک سەردانی ولاتی ئێرانم کردو چوومە شاری کرماشان، لەشاخی بێستوون پەیکەری شیرینو فەرهادم بینی لەقەد پالی شاخەکە، وەک هێمایەک بۆ ئەم ئەوینە پڕ واتایە، لەلایەن فەرهادی ئاشقو خۆشەویستی شیرینەوە دروست کرابوو. کۆتایی ئەم چیرۆکەش وەکو گشت چیرۆکەکانی تری خۆشەویستیو ئەوینداری تراژیدییە. ئەم داستانە لەلایەن خانای قوبادی بەشێوەزاری کۆنی گۆران نووسراوەتەوە. هەروەها کراوەتە شێوەزاری سۆرانیو وەریش گێڕدراوەتە سەر زمانی فارسیو تورکی. لەسالی 1946 لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانیش بەناوی (شیرینو فەرهاد بەکوردی) چاپو بلاو کراوەتەوە.

برادەرەکەشم گوتی: ئەم کتێبەت بەچاوەکانی خۆت بینیوە؟

منیش گوتم: لەسەرەتای سالّی حەفتاکان، خولیای ئەدەب بووم، هەر جارێک بۆ بازاڕ بڕۆیشتبام، دەچوومە کتێبخانەکەی گیوی موکریانی کەبرای حوسێن حوزنی موکریانییە، گشت کتێبە ئەدەبییە کۆنەکانو دەستنووسەکانی ئەوی چاپ کردبۆوەو لەناو جامخانەی چاپخانەکەی دانابوون. یەکێک لەو کتێبانە، چیرۆکی شیرینو فەرهاد بوو. هەروەها کتێبی مەمو زینی ئەحمەدی خانیو فڕی فڕی قەل فڕیو چیرۆکی کەلّەبابو دیوانی شیعریی زۆربەی شاعیرە کلاسیکەکانی کوردی چاپ کردبوونەوە، لەوانە دیوانی نالّیو فایەق بێکەسو وەفاییو حاجی قادری کۆییو چەندین دیوانی تر.

کەوام گوت، برادەرەکەم گوتی: ئەم کتێبەی باسی دەکەیت، مەبەستم کتێبی شیرینو فەرهادە، خوێندیتتەوە؟

منیش گوتم: وەکو پێم گوتی، ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە زۆر سەرنجییان ڕاکێشا بووم، بۆیە کەچاوم پێی کەوت، کڕیم دەستم بەخوێندنەوەی کرد، تا لێی نەبوومەوە، دەستم لێی هەلّنەگرت.

ئەویش گوتی: چەند لاپەڕە دەبوو؟

گوتم پەنجا لاپەڕە بوو. لەشێوەی شیعر بەکێشو سەروا نووسرابۆوە، بۆیە لەخوێندنەوەی بێزار نەدەبووم.

ئەویش گوتی: با بێینەوە سەر چیرۆکەکە، بۆم باس بکە، شیرین لەنێوان خوسرەو پاشاو فەرهادی پەیکەرتاش چی بەسەر هات؟

منیش گوتم: وەکو پێم گوتی خوسرەو پاشا شیرینی زۆر خۆش دەویست، بەڵام لەبەر ئەوەی شیرین فەرهادی خۆش دەویست، بۆیە تا لەیەکترییان دوور بکاتەوەو شیرین وەدەست بێنێ، بۆیە فەرهادی ڕاسپارد بەلێدانی تونێلێک بەناو شاخی بێستوون. فەرهادیش بەرلەوەی تونێلەکە لێبدات، وێنەی شیرینی لەقەدپاڵی شاخی بێستوون تاشی. هێشتا فەرهاد لەلێدانی تونێلەکە نەبیبۆوە، خوسرەو پاشا بەدرۆ هەواڵی مردنی شیرینی بۆ فەرهاد نارد. کەفەرهادیش ئەمەی بیست، لەتاو ئەشقی شیرین، بەو قوڵینگەی کەپەیکەری شیرینی پێ دروست کردبوو، خۆی کوشتو کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا. کەشیرین ئەمە دەبیستێ، دەڕواتە سەر تەرمەکەیو ئەویش لەوێ کۆتایی بەژیانی خۆی دەهێنێت. بەم شێوەیە چیرۆکی ئەم دوو خۆشەویستە بەتراژیدی کۆتایی پێ دێت.

برادەرەکەشم گوتی: چیرۆکەکە زۆر درێژ نییە، بۆچی ئەو برادەرەی سەر مێزەکەی بەرامبەرمان کردوویەتییە چیرۆکی عەنتەرو عەبلەو هەزارو یەک شەوە؟!

منیش گوتم: ئەو وەکو من بەکورتی نایگێڕێتەوە، کاریو بەهاراتی پێدا دەکاتو هەتا پێی بکرێ بۆی درێژ دەکاتەوە، تا نانی زیاتری پێوە بخوات.

# مەحبووبەی نالی

ئێوارەیەک لەگەڵ هەمان برادەرم چووینە یانەی ڕاگەیاندن. لەژێر سێبەری دار ئەرخەوانێک لەپشت مێزێک دانیشتین‌و داوای دوو بتڵ بیرەی فەریدەمان کرد. هێشتا دەستمان بەخواردنەوە نەکردبوو، شێخانی‌و وەلید جووتیارو حامد زامداریش گەیشتن، ئەم جارە کرمانجیشیان لەگەڵ بوو. سڵاویان لێمان کردو لەنزیک ئێمە لەپشت مێزێک دانیشتن. شاگردی یانەکە چووە لایان‌و پێی گوتن: چیتان دەوێ بۆتان بێنم؟

شێخانیش وەکو جاری پێشوو، گوتی: جارێ سندووقێک بیرەی (شەهرەزاد)مان بۆ بێنە، کەتەواومان کرد، سندووقێکی تریشمان بۆ بێنەوە.

کەوای گوت، هەندێک گەنج لەپشت ئێمەوە دانیشتبوون، بیرەیان لەپێش بوو، ئەوانیش دەیانخواردەوە، کەئەوەیان گوێ لێ بوو، لەقاقای پێکەنینییان داو بەدەنگێکی بەرز گوتیان: پەکو دەڵێی‌و شترن، چۆن ئەو هەموو بیرەیان پێ دەخورێتەوە!

حامد زامدارو وەلید جووتیار قسەی ئەو گەنجەیان پێ ناخۆش بوو، ئاوڕییان لێ دانەوە، ویستیان قسەیەکییان پێ

بڵێن، بەڵام کرمانج نەیهێشتو گوتی: هەقیانە توانجمان لێ بدەن، لەو یانەیە لەئێمە زیاتر کێ سندووقێک بیرەی لەپێش دایە.

شێخانیش گوتی: چی دەڵێن با بیڵێن، ئەگەر وا نەکەینو سەری خۆمان گەرم نەکەین، چۆن چیرۆکی (مەحبوبەی نالی) تەواو دەبێ؟

وا پێ دەچوو ئەم جارەش وەلید جووتیارو برادەرەکانی بەو مەرجە داوەت کردبێت کەچیرۆکی (مەحبوبەی نالی) بۆ بگێڕنەوە.

هاوڕێیەکەم گوتی: ئەوانە کێن بۆچی من نایانناسم؟

گوتم: ئەو کەسەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، ناوی وەلید جووتیارە، نووسەرێکی فۆلکلۆر پەروەرو دەرچووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدایە. ئەوەی تەنیشتیشی لەشاری بەغدا دادەنیشێتو لەڕۆژنامەی هاوکاری کار دەکات، نووسەرو ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگەو ناوی حامد زامدارە.

ئەویش گوتی: ئەی ئەو کوڕە گەنجەی کەلەگەڵیان دانیشتووە کێیە؟

گوتم: ئەو گەنجە ئەکتەرو شانۆکارە، ناوە هونەرییەکەی کرمانجە.

ئەویش گوتی: پێت نەگوتم ئەو کەسەی سەری مەجلیسی گرتووە، دەڵێی حاتەمی تائییە، کێیە؟ لەجیاتی بتڵێک بەسندووق بۆیان بانگ دەکات.

منیش گوتم: ناوی شێخانییە، فۆلکلۆر پەروەرەو ناوە ناوەش بەدەنگە ناخۆشەکەی حەیران دەڵێ، لەبەر ناخۆشی دەنگی حەیای حەیرانی بردووە.

هاوڕێیەکەشم گوتی: ئەو هەموو پارەو پوولەی لەکوێ بوو، دەرخواردی ئەوانەی دەدا؟

گوتم: خاڵێکی سەرۆک جاشە، بەگوتەی خۆی، لای ئەو بندیوارەو تەنها پارەکە وەردەگرێتو چەکی بۆ هەڵناگرێت.

ئەویش گوتی: ئەی بۆ ئیشو کارێکی تری پێ ناکات؟

منیش بەپێکەنینەوە گوتم: تەسەور دەکەیت جارێک ئازوقەی پێدا ناردبوو بۆ چەکدارەکانی فەوجەکەی، ئەو گێلۆیە ڕێگاکەی هەڵە کردبوو، لەجیاتی ئەوەی بچێتە سەنگەری چەکدارەکانی فەوجی خاڵی، ڕۆیشتبووە ناو پێشمەرگەو ئازوقەکەی دابوو بەوان. لەهەمووشی سەیرتر، کاتێک خاڵی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات، دەڵێ: (جیاوازیی چییە، ئەوانیش کوردن).

بەهەرحاڵ، وەلید جووتیار هۆنراوەکەی (نالی) کەلەسەر مەحبوبەی خۆشەویستی دانابوو، دەیخوێندەوەو بەدەم بیرە

خواردنەوەوە، لەسلۆری بۆی ڕاڤە دەکرد. شێخانیش سەری گەرم ببوو، خەیاڵی ڕۆیشتبوو بۆ دنیای ئەوینو لەتاوان هەر ئاخو ئۆفی بوو.

هاوڕێیەکەشم گوێیەکانی قوڵاخ کردبوو، گوێی لەچیرۆکی ئەویندارى نالىو حەبیبە گرتبوو، لەخۆشی چیرۆکەکە ئاگای لەمن نەمابوو.

منیش پێم گوت: دەڵێی پێشتر گوێت لەو چیرۆکە بووە وا پێی سەرسامیت؟

گوتی: گوێم لێ بووە کەنالی کچێکی خوشویستووە، بەڵام زۆری لێ نازانم، مەراقمە بزانم.

منیش گوتم: لەوان بگەڕێ، گوێ لەمن بگرە، من بۆت باس دەکەم.

ئەویش گوتی: دیارە شتێکی لێ دەزانیت؟

گوتم: کاتێک لەئامادەیی کوردستان قوتابی بووم مامۆستایەکمان هەبوو ناوی ئەمین ئەفەندی بوو، زمانو ئەدەبی کوردی پێ دەگوتین، زۆر بەجوانی ئەو شیعرەی بۆ ڕاڤە دەکردین.

ئەمەم گوتو دەستم کرد بەگێڕانەوەی چیرۆکەکەو پێم گوت: سەرەتا شیعرەکەت بۆ دەخوێنمەوە، دواییش بۆت ڕاڤە دەکەم.

گوتی: گوێم لێتە.

گوتم: پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵو قیچە، مەیلی شەڕ دەکا
خێڵو قیچە، یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا؟!
خێڵو قیچە یا بەغەمزە بۆ نیشانەی دڵ بەچاو
مەیلی ڕاست هاوێتنی موژگانی دڵ پەیکەر دەکا؟!
چاوی هەم ڕەنگی گوڵێ، مەستی شەوو ڕۆژن مەدام
یەک لەنەشگوفتەی بەنەقشە، یەک لەنەیلۆفەی دەکا
عەکسی چاوی تۆ لەچاویدا بەخواری تێدەگەی
کە چ نەزەرکەی فەرقی خوارو ژوورو، خێرو شەڕ دەکا؟!
هەرکەسێ نوقسانی ڕووی باوێتە سەر ڕووی کاینە
شاهیدی هەرچەندە ڕەئی ئەلعەینە، کێ باوەڕ دەکا؟!
کاتبی خێرو شەڕی عوششاقە، بۆ وەسڵو فیراق
لوتفو قەهری هەر بەجارێ سەیری دوو دەفتەر دەکا
ئەو وەحشی غەزالە کەس لەبەر داوی نەکەوت
چونکە شاهێنی دوو چاوی تیرە، دائیم سەر دەکا.

لێرەدا نالی زۆر زیرەکانە وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کەڕەخنە لەخۆشەویستەکەی دەگرنو پێی دەڵێن (خۆشەویستەکەت خێڵو قیچە). نالی لەوەڵامی ئەواندا دەڵێ : (یارەکەم خێڵو قیچ نییە، بەڵکو بەتیری بژانگی دڵی دڵدار پەی دەکات، ڕاست دەیهاوێ بۆ دڵو چوار پەلی، دڵی پێ ببڕێتەوە تا

دەرفەتی دەرباز بوونی نەمێنێ. دیارە تیرهاویژیش بۆ ئەوەی نیشانەکەی بەباشی بپێکێت، چاوێکی دەگرێتە نیشانەکەو چاوەکەی تریشی دەنووقێنێت.

هاوڕێیەکەشم گوتی: هەر ئەوەندەشە چیرۆکەکە؟!

منیش گوتم: بەکورتی ئەوەم بۆ گێڕایەوە، ئەدیبانو ڕەخنەگران هێندەی دەینو دەبەن، وەکو لاستیک درێژی دەکەنەوە. ئەگەر بتەوێ زیاتری لێ بزانیت، مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەددینی سەجادی بخوێنەوە، زۆر بەدرێژی باسی کردووە.

ئەویش گوتی: گێڕانەوەی ئەو شیعرە ئەوەندە دەهێنێ، ئەو برادەرە (وەک ئاماژەیەک بۆ شێخانی) بەسندووق بیرە دەرخواردی ئەو حوتانە بدات؟!

منیش گوتم: شێخانی کەسێکی ئاشقەو لەناو خەیاڵدا دەژیت، پارەو پوولێکی باشیشی لەبەر دەست دایە، وەلید جوتیاریش ئیستغلالی دەکاتو تا درەنگانی شەو بەدەم خواردنو خواردنەوەوە چیرۆکەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو وەکو بنێشتیش دەیجووێتەوە.

## نووسەر

لەگەڵ غەمگین قاوەچی بڕادەرم چووینە کتێبخانەی (سۆلاڤ) بۆ کڕینی ڕۆژنامەی (هاوکاری)و گۆڤاری (بەیان)و (ڕۆشنبیری نوێ). محەمەد جەمیلی خاوەنی کتێبخانەکە کتێبێکی لەناو ڕەفەی کتێبخانەکەی دەرهێنا، وێنەی دۆڵو زوڕنایەکی بەسازەوە لەسەر بوو، ناوی کتێبەکە (سێ سەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی)بوو، کتێبەکەی نیشان داین‌و گوتی: کتێبەکەی شێخانیمان پێ گەیشتووە، سێ سەد هۆنراوەی فۆلکلۆریی کوردی لەخۆی گرتووە.

کەوای گوت من سەرم سوڕما، لەبیری خۆمدا گوتم (ئەو داماوە مرد ئەوەندەی وەلید جووتیارو حامد زامدار داوەت بکات، بەیانییان بەسندووق بیرەی فەریدەو شەهرەزادییان دەرخوار بدات، نیوەڕۆیانیش لەچێشتخانەی مام یوسف قۆزیان بۆ بکڕێت تا یەک دوو چیرۆکی فۆلکلۆریی بۆ بگێڕنەوە. چۆن لەپڕێکدا بووە نووسەرو کتێبی فۆلکلۆری چاپ کرد)؟

غەمگین قاوەچی کتێبەکەی لەمحەمەد جەمیل وەرگرت‌و بەسەر سوڕمانەوە گوتی: بەڕاستی ناوی شێخانی بەسەرەوەیە!

محەمەد جەمیلیش گوتی: بۆچی سەرت سوڕماوە، لێی ڕانابینیت دەستی نووسینی هەبێت؟!

ئەویش گوتی: نازانم خوێندەواری هەیە، یان نا، بەڵام ئەوەندەی بزانم خولیای فۆلکلۆری کوردییەو بەردەوام وەلید جووتیار داوەت دەکات تا حیکایەتی بەر ئاگردانی بۆ بگێڕێتەوە.

منیش کتێبەکەم لەغەمگین قاوەچی وەرگرتو تەماشام کردو یەک دوو لاپەڕەم لێی خوێندەوە، بەکوردییێکی پەتیو داڕشتنێکی جوان نووسرابوو. بەغەمگین قاوەچیم گوت: دڵنیام کەبەخۆی نەی نووسیوە، هەبێو نەبێ، وەلید جووتیارو حامد زامدار بۆیان نووسیوە.

ئێمە لەم قسانەدا بووین، بێلافی هۆزانڤان هاتە کتێبخانەکەو چاوی بەکتێبەکەی شێخانی کەوت، بەپێکەنینەوە گوتی: ئەو قورمساغە بەپارە هەموو شتێک دەکات.

غەمگین قاوەچی گوتی: مەبەستت چییە؟

گوتی: ماوەیەک پێش ئێستا لەیانەی ڕاگەیاندن ئەوم لەگەڵ وەلید جووتیارو حامد زامدار بینی، باسی دانانی کتێبێکی فۆلکلۆری لەگەڵ دەکردن. ئەوان قسەیان بۆی دەکردو ئەویش بەڕیکۆردەر تۆماری دەکرد.

دەستپێکی کتێبەکە بەچەند دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆری دەستی پێ کردبوو، تیایدا هاتبوو:

تەمبەڵی کاری حیزو بێ خێرە
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە.
شیرین هۆ شیرین باوانم شیرین
ماچت دەرمانە بۆ زامو برین.
هەزار ساڵ بکەی بێگانە پەرستی
ئاخیری هەر دێنی نوشوستی.

کەبێلاف بینی لاپەڕەکان هەڵدەدەمەوەو بەبێ دەنگی دەیخوێنمەوە، گوتی: بۆ ئەوەی دڵنیا بیت کەهۆنراوەکانی ناو ئەم کتێبە وەلید جووتیار بۆی گێڕاوەتەوە، تەماشا بکە بزانە هیچ هۆنراوەیەک بەناوی (خەزاری)ی تیایە؟

منیش گوتم: یەکەمین هۆنراوە لەو سێ سەد هۆنراوانە، هۆنراوەی (خەزاری)یە.

ئەویش گوتی: وەلید جووتیار کەبۆی دەگێڕایەوە من گوێم لێ بوو، هۆنراوەیەکی ڕۆمانسیی زۆر خۆشە، بەدەنگی بەرز بیخوێنەوە باجەماعەتیش گوێیان لێ بێت.

منیش بەدەنگێکی بەرزو بەلاسایی کردنەوەی دەنگی شوکرولای بابان شیعرەکەم بۆ خوێندنەوەو گوتم:

کاکە هەنارە خۆشە زۆر بەباخچەو هەنارە
جارەک خەزار نەبینم خەمە لەدرێ من یارە
خەزار دەرێ وەی دایە ڕەنگم لەڕوان بڕایە
ڕۆژەک لاوم نەبینم بەخودای ئاقرم گۆڕایە
خەزارێ کچێ خەزارێ کابانی گەورە مارێ
توخوا بێنە ماچ بکەم بن بسکان‌و بن گوارێ
توخوا گەلەک مەترسێ عالەم لۆ من چ نارێ

لەو کاتەی هۆنراوەکەم دەخوێندەوە، کوڕێکی گەنج هاتە کتێبخانەکەو لەکتێبەکانی مەحموود دەروێش‌و غەسان کەنەفانی دەپرسی، کەگوێی لەهۆنراوەکە بوو، بەتەوسەوە گوتی: ناکات بەمەش بڵێن شیعر؟!

منیش گوتم: بۆچی ئەقڵت نایگرێت؟

گوتی: کەی باوی ئەم قسە قۆڕانە ماوە، ئێمە لەسەدەی بیستەمدا دەژین، سەردەمی حەداسەیە نەک فلق‌و هۆڕی کوردی!

کەزانیم گەنجێکی تورەو یاخییە، هیچ دەنگم نەکرد.

بێلافیش ڕووی لەئێمە کردو گوتی: پێم نەگوتن وەلید جووتیار ئەم هۆنراوانەی بۆ گێڕاوەتەوەو خۆی نەی نووسیوە.

# بەساڵاچووانو بازاڕی کتێب

تـــازە نـــامیلکەی (لێکـــدانەوەی یاســـای بەکرێـــدان)م چـــاپ کردبـــوو، ســـەردانی کتێبخـــانەی شـــێخانیم کـــردو ڕێـــزمەیەکم لەکتێبەکە بۆ بـرد، داوام لێی کـرد دانەی بەدیناڕێک بفرۆشـێت. دانەیەکـی لـێ وەرگـرتمو هەنـدێک سـەیری کـردو بەتەوسـەوە گـوتی: شــاکارەکانی عەزیــز نەســینو یەشــار کەمــال لەســەر ڕەفەی کتێبخــانە کەوتــوونو تۆزیــان لــێ نیشــتووەو کەس بەلایانەوە ناچێت، دەتەوێ ئەم نامیلکە بچووکەی تۆ دینـارێکی پێ بدەن؟

منـیش گـوتم: ئەم کتێبەجیـاوازە، کتێبـی ئەدەبـی نییە، ڕاڤەو لێکـدانەوەی یاســای بەکرێـدانەو پەیوەنـدی بەچـینو تـوێژێکی هەژارو کەم دەرامەتـــی کۆمەڵگـــا هەیە. هاوڵاتییـــان دەتـــوانن سوودی لێ وەربگرن بۆ داکۆکی کردن لەمافەکانییان بەرامبەر چینــی بەکرێــدەران، کەچینێکــی ســـەرمایەدارو دەوڵەمەنــدن، تائەندازەیەک زۆربەیان ئامانجییان تەنها بەدەستهێنانی پارەیەو سۆزو بەزەییان بەرامبەر کرێچییەکان نییە.

کەوام گـوت، سـەری خـۆی لەقانـدو گـوتی: دەڵێی لەمو لاتە ناژیت؟!

گوتم: بۆچی؟

گــوتی: ئێــرە عێــراقە، ئەوروپــا نیــیە، ئەو قســانەی کەتــۆ دەیکەیت، بۆ شــوێنێک باشــە، یاسا تیایدا ســەروەر بێت. لێرە خاوەن موڵک ئەگەر بیەوێ کرێچیەک دەربکات، پێویستی بەم بینەو بەردەیە نییە، لەجیاتی ئەوەی ڕێگای دادگا بگرێتە بەرو ســاڵێک چــاوەڕوان بکــات، چــاوی لــێ ســوور دەکــاتەوەو دوو کەسی خوێڕی دەنێرێتە سەری‌و بەشەق‌و پێلەقە دەری دەکەن.

کەوای گــوت، ئەنجــوومەنی یاســادانانم بیــرکەوتەوە، کاتێــک لەگەڵ پــارێزەر سەربەســتی هــاوڕێم ڕۆیشــتینە لای جێگــری ســــەرۆکی ئەنجـــوومەنەکەو ئەو بـــرادەرەم کەبەنـــاو ئەوی دەناســـی‌و هــاوڕێی بــوو، منــی پــێ ناســاندو باســی گرنگــی کتێبەکەی بۆ کردو پێی گوت: (کتێبێکی یاساییەو سوودێکی زۆری هەیە بــۆ ئەنجــوومەنی یاســا دانــان‌و دەیــان زاراوەی یاســایی بەزمــانی کــوردی تیــایەو لەکــاتی دانــانی یاســاکاندا سوودی لێ وەردەگرن). ئەوکات لەدڵی خۆمدا گوتم (هەر هــیچ نەبــێ بەقەدەر ژمــارەی ئەنــدامانی ئەنجــوومەنەکە کتێــبم لــێ دەکڕێـــت)، بەڵام ئەم خەونەم نەهـــاتە دی‌و خەیـــاڵ پـــڵاو دەرچــووم. هێشــتان بــرادەرەکەم لەقســەکانی نەبووبــۆوە، بــێ ئەوەی هــیچ نرخێــک بــۆ کتێــبەکەو هــاوڕێیەتی خــۆی‌و ئەو برادەرەم دابنێت‌و ڕێزیش لەوشەی کوردی بگرێت، گوتی: (ئەم

کتێبەبۆ ئێمە دەست نادات، چونکە بەزمانی کوردی نووسراوە ئەگەر بەزمانی عەرەبی بووایە دوو دانەم بۆ کتێبخانە دەکڕی).

من لەو بیرکردنەوەیەدا بووم، شێخانی گوتی: ئێستا باوی کتێبی بۆپێکەنینو خەون نامەو قسەی نەستەقو مەتەڵو گۆرانی فۆلکلۆری کوردییە. ئەگەر پێشتر پێت بگوتبام نەم دەهێشت پارەکەت لەشتێکی وەها خەرج بکەیت.

کەوای گوت، لەدڵی خۆمدا گوتم (خاتری گرتوومەو هەندێکی تێدا هێشتۆتەوە، دەنا دەیگوت نەمدەهێشت پارەی خۆت لەو شتە قۆڕانە خەرج بکەیت).

بەهەرحاڵ، هیچ ئومێدێکم پێی نەماو تەنانەت پەشیمانی کردمەوە لەوەی کەجارێکی تر بیر لەچاپکردنی کتێب بکەمەوە. دەستم دایە کتێبەکانمو ویستم بڕۆم، فیکەیەکی درێژی لێداو گوتی: بیرم کەوتەوە، خۆم دەزانم ئەو کتێبانەت چۆن بۆ ساغ دەکەمەوە.

منیش گوتم: گەر مەبەستت ئەوە بێت وەکو ڕۆمانی بۆرەو کتێبەکانی تر بیفرۆشیتە کارگەی کرێمەستی، من ڕێگات پێ نادەم، چونکە کتێبم بۆ کارگەی کرێمەستی چاپ نەکردووە.

ئەویش گوتی: ئەو چاپکراوەی تۆ قەبارەی زۆر بچوکەو بەکەلکی کارگەی کرێمەستی نایەت، بۆیە پارەی پێ نادەن.

منیش بەتەوسەوە پێم گوت: خۆ بەتەمانیت ئاودیوی ئێرانی بكەیت؟!

گوتی: تۆ هەقت لەهیچ نەبێت، ئەم كتێبانە بەجێ بهێڵەو بڕۆ ماڵەوە ئەوانی تریشم بۆ بێنەو سەری مانگ وەرە لای برای خۆت پارەكەم لێ وەربگرە.

هەڵوەستەیەكی كردو گوتی: بەڵام یەك تاكە مەرجم هەیە.

گوتم: ئەو مەرجە چییە؟

گوتی: نیوەی پارەكەت لێ وەردەگرم، فیفتی فیفتی.

گوتم: عەیبی نییە، ڕازیم.

ئەمەو كتێبەكانم تەسلیم كردو گەڕامە ماڵەوەو بەتەكسیەك كتێبەكانی تریشم بۆی هێناو بەرلەوەی بڕۆم جارێكی تر لێم دووبارە كردەوە كەچۆن بەماوەیەكی كورت ئەو كتێبانە دەفرۆشێت؟

هەمدیس پێی نەگوتمو منی لەناو مەراقدا هێشتەوە.

دوای چەند ڕۆژێك، لەبازاڕ چاوم بەهاوڕێیەكم كەوت، دەستخۆشی كتێبەكەی لێ كردمو گوتی: تا كتێبەكەی تۆم نەخوێندەوە، نەم دەزانی یاسا تاچەند پشتیوانی لەچینی كرێچییان كردووە.

منیش گوتم: لەبەر ئەوەی سیستمی حوکمڕانی لەعێراقدا سۆشیالیستییە بۆیە گشت یاساو ڕێساکان لەبەرژەوەندیی چین‌و توێژی هەژارو کەم دەرامەت دایە.

بیرم لەوە دەکردەوە کەئەو هاوڕێیەم چۆن ئەم کتێبەی منی بەدەست کەوتووە؟ لەدڵی خۆمدا گوتم (تۆ بڵێی لەکتێبخانەی شێخانی نەیکڕیبێت).

پێم گوت: ئەم کتێبەت چۆن دەست کەوتووە؟

گوتی: لەگەڵ مووچەی سەری مانگ ئەم کتێبەیان دابووە داپیرم.

منیش گوتم: مەبەستت مووچەی خانەنشینە؟

گوتی: داپیرم نەخوێندەوارەو پێشتر هیچ وەزیفەیەکی نەبووە تا خانەنشین بێت.

گوتم: ئەدی ئەو مووچەیە بەچ ناوێک وەردەگرێت؟

گوتی: لەبەڕێوەبەرێتی چاودێریی کۆمەڵایەتی ئەو پیرەژن‌و پیرەمێردانەی وەک داپیرم کەهیچ سەرچاوەیەکی داراییان نییە، مانگانە وەک یارمەتی بڕی سی دیناریان پێ دەدەن.

لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی: وەک داپیرم بۆی باس کردم، لەگەڵ مووچەی ئەم مانگە، ئەم کتێبەیان بەدینارێک بەبێ ویستی خۆیان‌و بەزۆری پێیانداون .

کەئەمەی گوت، کزە لەجەرگم هاتو زۆر خەفەتم خوارد، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەو شێخانییە ساختەچییە بەچ ویژدانێک ئەم داماوانەی بەتەڵەوە کردووە، ئەگەر بمزانیبا ڕێگەم نەدەدا کارێکی وەها قێزەون بکات).

ڕووم لەبرادەرەکەم کردو پێم گوت: کەکتێبەکەت لەداپیرت وەرگرت هیچی نەگوت؟

ئەویش گوتی: داپیرم زۆر تووڕە بوو، خەنجەرت لێ دابا، خوێنی لێ نەدەهات. دونیایەک جوێنی بەحکومەت دا، دەیگوت ئەو دینارەی منیان وەک گۆشتی سەگ لێ حەرام بێت.

کەوای گوت، داوای لێبووردنم لێ کردو پێنج دینارم لەگیرفانم دەرهێناو پێم داو گوتم: ئەم بڕە پارەیە بدە بەداپیرتو لەجیاتی من داوای لێبووردنی لێ بکەو پێی بڵێ: (دانەری کتێبەکە ئاگادار نییە ئەم کتێبە چۆن گەیشتۆتە بەڕێوەبەریێتی چاودێریی کۆمەڵایەتیو بەچ هەقێک بەزۆری بەسەر ئەو داماوانەیان دابەش کردووە؟

زۆرم مەراق بوو بزانم ئەم قورمساغە چۆن ئەم کارەی کردووە، شەیتان بیری لێ نەکردۆتەوە، ئەوەبوو ڕۆیشتمە کتێبخانەکەیو پێم گوت: تۆزێک پێش ئێستا کەسێکم بینی

باسی شتێکی وەهای دەکرد سەبارەت بەکتێبە نوێیەکەم، پێم نالێی چۆن ئەم کارەت کردووە؟!

بەپێکەنینەوە گوتی: بەڕێوەبەری ئەو فەرمانگەیە لەترسی سەربازی لای خالم خۆی بەجاشی بن دیوار ناونووس کردبوو، خالم مووچەکەی لەجیاتی وەردەگرتو سەری مانگان عەدەم تەعەڕوزی پێ دەدا. جا کەئەو کتێبانەی خۆتت بۆ هێنام، بیرم لەوە کردەوە لەڕێگای ئەوەوە بیانفرۆشم.

# وەشانخانە

لەشاری بەغدا لەشەقامی ڕەشید لەهوتێل (ئەربیل) دابەزی بووم، دەستنووسی کۆمەڵە چیرۆکی (دەرگا)م لەگەڵ خۆم بردبوو، دەمویست بیبەمە دەزگای سانسۆری کتێب بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندییان لەسەر چاپو بڵاوکردنەوەی.

جانتاکەم لەژوورەکەم داناو لەساڵۆنی هوتێلەکە بەدیار تەلەفزیۆنەکەوە دانیشتبووم، گوێم لەهەواڵەکان دەگرت، شێخانیم بینی، جانتایەکو دوو مەنجەڵی فافۆنی بەتاڵو کیسەیەکی پێ بوو، کەچاوی بەمن کەوت، گوتی: لێرە چی دەکەیت؟

گوتم: دەستنووسێکی خۆم هێناوە، بەنیازم بەیانی بیبەم بۆ دەزگای سانسۆری کتێب بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندییان لەسەر چاپو بڵاوکردنەوەی.

ئەویش گوتی: منیش دەستنووسی هەندێک ئەدیبم هێناوە بۆیان چاپ دەکەم، ئەگەر بتەوێ کتێبەکەی تۆش چاپ دەکەم.

منیش گوتم: چۆن چاپی دەکەیت؟

گوتی: وەکو ئەو ئەدیبانە، بریکارنامەیەکت لێ وەردەگرم، دوو سەد دیناریشم بدێ، خۆم ڕەزامەندی دەزگای سانسۆری

کتێبت بۆ وەردەگرمو دواییش لەچاپخانەی (الحوادث) دوو هەزار دانەت بۆ چاپ دەکەم.

منیش گوتم: تۆ دڵنیایت بەدوو سەد دینار ئەوەم بۆ دەکەیت؟

گوتی: دەزانم گاڵتەت بەقسەکانم دێت.

لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەم گێلە چ لەکتێب دەزانێت تا چاپی بکات)؟

ئەویش گوتی: بیر لەچی دەکەیتەوە، قسەیەک بکە.

منیش گوتم: چاپکردنی کتێب پارەیەکی زۆری دەوێ، چۆن بەدوو سەد دینار دوو هەزار دانەم بۆ چاپ دەکەیت؟

گوتی: تۆ ناتەوێ کتێبەکەت چاپ بکەمو بیدەمەوە دەستت؟

گوتم: گوتیان کوێرە چیت دەوێ، گوتی دوو چاوی ساغ، لەوە زیاتر چیم بوێ؟!

گوتی: کەواتە پێویست ناکات دوو دڵ بیت، بەیانی لەگەڵ یەک دەچینە فەرمانگەی دادنووسی ڕەسافە، بریکارنامەیەکم بۆ بکەو تۆ هەقت بەسەر هیچی ترەوە نەبێت، برای خۆت گشت کارەکانت بۆ دەکات.

منیش گوتم: ئەو دەستنووسانەی لەلاتن هی کێن؟

گـــوتی: ڕۆمـــــانی (بـــۆرە)ی عەزیـــــزی مەلای ڕەش‌و (قەرەچـوغ)ی غەفـار مەخمـووری‌و (ژیـان‌و هـونەر)ی تـاهیر کرمانج‌و دیوانێکی شیعریی قوبادی جەلی زادەشم لەلایە لەگەڵ (مەرگی تاقانەی دووەم)ی بەختیار عەلی.

کەوای گوت، لەبیری خۆمدا گوتم (ئەو شـێخانییە بەوە نییە گێلـۆکەیە، کەسـێکی فێڵبـازو سـاختەچییە، ئەو پـارە زۆرەی لەکوێ بـوو، کتێب بۆ ئەو هەمـوو خەڵکە چـاپ بکـات، خـودا دەزانێـت چـۆن ئەوانـی لەخشـتە بـردووەو دەیەوێـت منـیش بترێنێـت‌و بەنـاوی چـاپکردنی کتێـب، دوو سـەد دینـارم لـێ بەرداتەوە)، لەو بیرکـردنەوەیەدا بـووم، شـێخانی گـوتی: بیـر لەچی دەکەیتەوە؟

گـوتم: بیـرم لەقسـەکانی تـۆ دەکـردەوە، ئەقڵـم قسـەکانت ناگرێـت، قسـەیەک بـکە ڕێـی تـێ بچێـت، ئەوەی تـۆ دەیڵێیـت، تەنـانەت دەزگـایەکی وەکـو بەڕێـوەبەرێتی گشـتی ڕۆشـنبیری کوردیش پێی ناکرێت!

ئەویـش گـوتی: ئەوەنـدە کتێبە هـیچ نییـە، پـڕۆژەیەکم لەبەر دەسـتە، بـریتییە لەچـاپکردنی سـەد کتێـب بـۆ ئەدیـب‌و نووسـەرانی کـورد. ئەو ئەدیبـانەی کەنـاوم هێنـان، بەشـێکن

لەوان، زۆر کەســـی تــریش پێیــان گوتــوم، بەڵام هێشـــتان دەستنووسم لێ وەرنەگرتوون.

کەوای گوت، لەدڵی خۆمدا گوتم (تۆ بڵێی من لەو هەموو ئەدیبو نووسەرە ئاقڵتربم کەڕیشی خۆیان داوەتە دەست ئەم گێلۆکەیە)، بۆیە بڕیارمدا منیش پارەی بدەمێو ئەو قومارەی لەگەڵ بکەم .

گـــوتی: ئەگەر لەژوورەوە کەســـت لەگەڵ نیـــیە، منـــیش لەژووری تۆ دەخەوم.

گـوتم: کەســم لەگەڵ نیـیە، پـێم خۆشــە تـۆم لەگەڵ بیـت. کەناوی خۆت تۆمار کرد، بەدرێژی باسی پڕۆژەکەتم بۆ بکە. بـزانم بیـرۆکەی ئەم پـڕۆژەیەت لەکـوێ بـۆ هـات، حەزدەکەم بەدرێژی بۆم باس بکەیت.

ئەوەبوو چووە لای بەڕێوەبەری پرسـگەی هـوتێلەکەو پێی گوت: ناوم لەژووری ئەو برادەرە تۆمار بکە.

بەڕێوەبەری پرسگەی هوتێلەکەش ڕووی لەمن کردو گوتی: ڕازی ئەو برادەرە لەژووری تۆ بخەوێت؟

گوتم: ئێمە لەمێژە یەکتر دەناسـین، ئەو لەگەڵـم بێت باشـترە لەکەسێکی تر کەنەیناسم.

هوتێل (ئەربیل) لەشەقامی ڕەشید لەنزیک گۆڕەپانی مەیدان بوو، هوتێلێکی دوو نهۆمی کۆن بوو. کۆمەڵێک ژووری دوو نەفەری تێدا بوو، هەروەها چەند ئاودەستو دەستشۆرێکیش لەتەنیشت یەک لەدەرەوەی ژوورەکان هەبوون، هۆڵێکی دانیشتنیش لەناوەڕاستی هوتێلەکە هەبوو میوانان لێی دادەنیشتن.

دوای ئەوەی شێخانی ناوی خۆی تۆمار کرد، کەلوپەلەکانی خۆی هەڵگرتو هێنایە ژوورەوەو جانتاکەی لەسەر قەروێلەکە داناو کیسەو مەنجەڵە فافۆنەکانیشی لەپشت دەرگا داناو گوتی: لەتاریکو ڕوونەوە بەڕێ کەوتووم، زۆر ماندووم، دەمەوێ پاڵ بکەومو هەندێک چاوەکانم گەرم بکەم.

منیش گوتم: پێش ئەوەی بخەویت، پێم بڵێ ئەو مەنجەڵە فافۆنانەت بۆچی هێناوە؟

بەپێکەنینەوە گوتی: ئەوە ئیشی خۆمە، با هەندێک بخەوم، کەهەستامەوە بۆت باس دەکەم.

ئەمەی گوتو بێ ئەوەی پێڵاوەکانی لەپێ بکاتەوە، لەسەر تەختەکە لێی ڕاکشاو تا ئێوارە هەڵنەستایەوە.

سەیری کیسەکەم کرد، قەرسیلی گەنمو پارچە خامێکو بەنێکی تێدا بوو. کەچاوم پێ کەوت، لەبیری خۆمدا گوتم

(بەپێی ئەو پارچە بەن‌و پووش‌و پەڵاشە بێت، لەوە دەچێت بەو مەنجەڵانە لەهەولێر ماستی بەدیاری بۆ کەسێک هێنابێت).
بەڵام زیاتر پووش‌و پەڵاشی ناو کیسەکە سەرنجی ڕاکێشابووم، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەوە زانیمان ماستی لەناو ئەو مەنجەڵە فافۆنانە هێناوە، بەڵام ئەم پووش‌و پەڵاشەی بۆچی فڕێ نەداوە)؟

دیمەنی پووش‌و پەڵاشەکە مێشکییان ئاڵۆز کردبووم، هەرچەندی دەمهێناو دەمبرد، نەم دەزانی ئەم پوش‌و پەڵاشەی بۆچی فڕێ نەداوە؟

بەهەرحاڵ، کەلەخەو هەستایەوەو بینی نەخەوتوومو بەئاگام، گوتی: چما تۆ نەخەوتی؟

منیش گوتم: لەمەراقی ئەم مەنجەڵە فافۆن‌و پووش‌و پەڵاشانە خەوم لێ نەکەوت.

گوتی: بۆچی بۆنیان لێ دێت؟

گوتم: بۆنییان لێ نایەت، سەرم لەکارەکانی تۆ سوڕماوە، لەلایەک کۆمەڵێک دەستنووسی ئەدیب‌و نووسەرانت لەلایە، گوایە بۆیان چاپ دەکەیت، لەلایەکی تریشەوە ئەو مەنجەڵە فافۆنە بەتاڵانەو پوش‌و پەڵاش‌و خام‌و بەنانەت لەگەڵ خۆت

هێناوە، هەرچەندی بیری لێ دەکەمەوە، سەرم لێی دەرناچێت، نازانم ئەو شتانەت بۆچی لەگەڵ خۆت هێناوە .

ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: لەوانەیە لەدڵی خۆتدا بەکەسێکی گێل‌و گەمژەت لەقەڵەمدابم؟

منیش گوتم: سەرم لەو کارانەی تۆ دەرناچێت.

ئەویش ئیشارەتی بۆ مەنجەڵو پوش‌و پەلاشەکان کردو گوتی: هەموو کارەکانم لێرە بەهۆی ئەم مەنجەڵە فافۆن‌و پوش‌و پەلاشانەوە ڕایی دەبێت.

گوتم: چۆن؟

گوتی: پەلەمەکە، بەیانی بەیەکەوە دەچینە بەڕێوەبەریتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی، ئەوکات بەچاوەکانی خۆت دەیبینی بۆچی ئەم مەنجەڵە فافۆنانەم لەهەولێرەوە لەگەڵ خۆم هێناوە.

ئەوەبوو ڕۆژی دواتر دوای ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد، ڕۆیشتینە فەرمانگەی دادنووسی ڕەسافەو بریکارنامەیەکم بۆی دەرکردو بەیەکەوە چووینە بەڕێوەبەریتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی .

لەنزیک ئەو شوێنە مارکیتێکی بچووکی لێ بوو، شێخانی ڕۆیشتە مارکێتەکەو چوار سەتڵ ماستی کانوونی کڕی‌و لەبەردەم مارکێتەکە ماستەکەی بەتاڵ کردو خستییە ناو دوو

مەنجەڵە فافۆنەکەو دواییش پارچە خامەکانی لەسەر دانان‌و پووش‌و پەڵاشەکەشی لەسەر پەرت کردو بەپارچە کندرەکە هەردوو مەنجەڵەکانی توند بەستەوەو بەپێکەنینەوە گوتی: ئێستا زانیت ئەم مەنجەڵە فافۆنانەم لەهەولێرەوە بۆچی هێناوە؟!

خاوەنی مارکێتەکە کەئەم دیمەنەی بینی، زۆر بەلایەوە سەیر بوو، بەسەرسورمانەوە پێی گوت: کورم بۆچی سەتڵەکانت بەتاڵ کرد؟ ئەم سەتڵانە پلاستیکین، یەکجار بەکار دێن، بۆ خۆت بێت، نامەوێتەوە.

ئەویش سەتڵەکانی دایە خاوەن مارکێتەکەو گوتی: ئەم سەتڵانە بۆ خۆت بێت، من نامەوێت.

خاوەنی مارکێتەکە تەماشایەکی منی کردو سەری خۆی لەقاندو لەبەر خۆیەوە بەدەنگێکی نزم گوتی: بەڕاستی ئەمە شێتە!

ئەوەی ڕاستی بێت، منیش نەمزانی بۆچی ئەم کارە دەکات.

بەهەرحاڵ، هەردوو مەنجەڵە ماستەکانی هەڵگرت‌و ڕۆیشتینە بەڕێوەبەریتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی‌و بەبەرپرسی پرسگەی گوت: لەهەولێرەوە ئەم ماستەم بۆ مامۆستا موسلیح جەلالی هێناوە، دەمانەوێ بچینە لای.

ئەویش تەلەفۆنەکەی هەڵگرتو قسەی لەگەڵ سکرتێرەکەی کردو پێی گوت: دوو گەنج لەهەولێرەوە هاتوون، دەیانەوێ بچنە لای بەڕێوەبەری گشتی.

ئەمەی گوتو تەلەفۆنەکەی داخستەوەو ڕووی لەشێخانی کردو پێی گوت: هەندێک چاوەڕێ بن تا وەڵامان دەداتەوە.

هەندەی پێ نەچوو، زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا، هەڵیگرتو پێی گوتین: مامۆستا مەسلیح جەلالی دەڵێ بابێن.

شێخانیش هەردوو مەنجەڵە ماستەکەی هەڵگرتو پێش ئەوەی بچینە لای بەڕێوەبەری گشتی لایدایە ژوورێک، دوای چاکو چۆنی کردن مەنجەڵە ماستێکی لەدوو مەنجەڵەکە پێ داو گوتی: ئەم مەنجەڵە ماستی مەڕەم لەهەولێرەوە بەتایبەتی بۆ تۆ هێناوە.

فەرمانبەرەکەش سوپاسی کردو گوتی: نازانم چۆن پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە، هەموو جارێک ماستی هەولێرم بۆ دەهێنی.

ئەویش جانتاکەی کردەوەو کۆمەڵێک دەستنووسی لەبەردەم دانا، بەدەستنووسەکەی منیشەوەو گوتی: ئەوەندە بەسە کەتۆ پاڵپشتو هاوکارمانی لەچاپکردنی بەرهەمە ئەدەبیو فۆلکلۆرییەکان.

ئەویش گوتی: فەرمـوون دانیشـن، تـا چـایەک دەخـۆنەوە نووسراوی ڕێ پێدانتان بۆ دەکەمو لەگەڵ خۆتان ببیەنەوە.

ئەویش گوتی: تا تۆ کارەکەت تەواو دەکەیت، ئێمە دەچینە لای مامۆستا موسلیح جەلالیو سەلامێکی لێ دەکەینو هەر لەوێشەوە سەرێک لەمامۆستا حامد زامدارو لەتیف هەڵمەتو ئەحلام مەنسوریش دەدەین.

بەم شێوەیە، مەنجەڵە ماستەکەی تری هەڵگرتو بەیەکەوە ڕۆیشتینە لای بەڕێوەبەری گشتیو پێی گوت: مامۆستا گیان ئەم مەنجەڵە ماستی مەڕەم بۆ براژنمو منداڵەکان هێناوە، هیوادارم بەدڵیان بێت.

ئەویش گوتی: چۆن بەدڵیان نابێت، کەس هەیە ماستی هەولێری بەدڵ نەبێت؟!

بەڕێوەبەری گشتی ڕێزێکی زۆری لێ گرتینو ڕووی لەشێخانی کردو پێی گوت: هەر کارێکت لێرە هەبێت پێم بڵێ شەرم مەکە.

ئەویش گوتی: ئەگەر لێت ڕانەبینم، تەکلیفت لێ ناکەم، هەندێک دەستنووسی نووسەرو ئەدیبانی هەولێرم هێناوە، مەمنوون دەبم ئەگەر نووسراوێکم بۆ فەرمانگەی فرۆشتنی پەڕاوو کەرەستەی چاپ بۆ بکەیت. بۆ ئەوەی

پێداویستییەکانی چاپکردنی ئەو کتێبانەم بەنرخی فەرمی پێ بدەن.

ئەویش پارچە کاغەزێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرتو شتێکی لەسەر نووسیو دایە دەستیو پێی گوت: ئەم کاغەزە بدە بەشی کارگێڕیو خۆیەتی، با نووسراوێکت بۆ بکەن.

ئەویش کاغەزەکەی لێ وەرگرتو بەیەکەوە ڕۆیشتینە بەشی کارگێڕیو خۆیەتی. لەوێ چاومان بەسیروان بەکر سامی کەوت، لێمان پرسی لێرە چی دەکات؟

گوتی: ماوەیەکە ڕاژەی خۆم بۆ ئێرە گواستۆتەوە، بەرپرسی ئەم بەشەم.

کەوای گوت، شێخانی کەوتە پیاهەڵدانو ستایشکردنیو گوتی: ئێوە خانەوادەیەکی دیارن لەشەقڵاوە، باوکت ئەفسەرێکی دیارو بەناوبانگ بووە، دڵخۆشم کەلێرە دەتبینم، بۆ ئێمەی خەڵکی شاری هەولێر تۆ لێرە بیت باشترە لەکەسێک کەنەیناسین.

ئەمەی گوتو کاغەزەکەی بەڕێوەبەری گشتی دایەدەستیو پێی گوت: دەستنووسەکان لەلای بەرپرسی سانسۆری چاپەمەنییەکانە.

ئەویش گوتی: ئەگەر تەواو بووە، وەریان بگرنەوەو بۆمی بێنە لەنووسراوەکە ئاماژیان پێ دەدەمو دەیانکەمە هاوپێچو بۆ فەرمانگەی فرۆشتنی پێداویستییەکانی چاپەمەنی ڕەوانەی دەکەم تاکو کەرەستەو پێداویستی چاپکردنت بۆ خەرج بکەن.

ئەویش بەمنی گوت: تۆ لێرە دانیشە، من دەچمە لای بەرپرسی سانسۆری چاپەمەنییەکانو دەستنووسەکان وەردەگرمەوەو دێمەوە لاتان.

ئەمەی گوتو ڕۆیشت. زۆری پێ نەچوو، بەخۆیو باوەشێک دەستنووس هاتە ژوورەوەو دەستنووسەکانی لەسەر مێزی سیروان بەکر سامی داناو گوتی: ئەمە ئەو دەستنووسانەن کەچاپیان دەکەم. هەر کتێبێک لەوانە بەتیراژی پێنج هەزار دانەو بەکاغەزی سپی هەشتا غرامیو بەرگەکەشی بەکارتۆنی ئارت بەڕەنگاوڕەنگ چاپ دەکەم.

کەگوێم لەو ژمارە زۆرەی تیراژی چاپکردنە بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم (تا هەزار کتێب دەفرۆشرێت نزیکەی ساڵێک کتێبەکان لەسەر ڕەفەی کتێبفرۆشەکان دەمێنێتەوە). ویستم پێی بڵێم کەئەو ژمارەیە زۆرە کەمی بکاتەوە، بەڵام پەشیمان بوومەوە، لەدڵی خۆما گوتم ( بۆچی تێکەڵی کارێک بم کەپەیوەندی بەمنەوە نییە).

سیروان بەکر سامی نووسراوەکەی بۆ کردو هەر خۆشی بردییە لای بەڕێوەبەری گشتیو پێی ئیمزا کردو هێنایەوەو دوای دانانی ژمارەی دەرچوون لەسەری، خستییە ناو زەرفێکو دایە دەستیو پێی گوت: ئەگەر گەڕایتەوە هەولێر، سڵاومان بەبرادەران بگەیەنە.

بەم شێوەیە نووسراوەکەی لەگەڵ دەستنووسەکانی خستە ناو جانتاکەییو هاتینە دەرەوە.

منیش گوتم: ئێستا بۆ کوێ دەچینو چ کارێکی ترت ماوە؟

گوتی: دەچینە ئەجهیزە دەقیقە، کەرەستەکان لەوێ وەردەگرینو دەیبەینە چاپخانەی (الحوادث)

ئەمەی گوتو لەگەڵ تاکسییێک ڕۆیشتینە شوێنی فرۆشتنی پێداویستییەکانی چاپەمەنی. نووسراوەکەی دانیو بەنرخی فەرمی گشت پێداویستییەکانی لێ وەرگرتنو لەپێکابێک باری کردنو بەرەو چاپخانەی ئۆفسێتی (ئەلحوسام) بەڕێ کەوتین.

لەڕێگا بیرم لەوە دەکردەوە کەکۆمەڵە چیرۆکەکەم لەدووتوێی بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگو قەشەنگو بەکاغەزی سپیو تیراژی پێنج هەزار دانە چاپ دەکرێت، بەمەش بەرهەمەکەم خوێنەری زۆر دەبێت.

کەگەیشتینە چاپخانەکە، منی لەبەر دەرگا بەجێ هێشت‌و گوتی: تا من ئەم کەرەستانە دەبەمە چاپخانە تۆ پیاسەیەک بکەو چاوێک بەکتێبەکانی سەر شەقام بخشێنە .

ئەوەم زۆر بەدڵ بوو، ماوەیەکی زۆر بوو نەهاتبوومە شەقامی موتەنەبی‌و چاوم بەکتێبەکانی ئەو شەقامە نەکەوتبوو. بۆیە تا ئەو کارەکانی خۆی تەواو کرد، سەیری کتێبەکانم کردو  هەندێک کتێبیشم کڕی.

دوای ماوەیەک ئەویش هات‌و گوتی: ئەو کتێبانە چین، بۆچی مێشکی خۆتیان پێوە ماندوو دەکەیت؟

منیش گوتم: ئەی ئێمە بۆچی نووسەرین ئەگەر دوو کتێب نەخوێنینەوە، جیاوازیمان لەگەڵ ئەو کەسانە چی دەبێت کەنەخوێندەوارن.

گوتی: دەنا من مێشکی خۆم بەشتی وەها ماندوو ناکەم.

منیش گوتم: هەقتە وابڵێی، تۆ کەسانێکت هەن، هۆنراوەو چیرۆکی فۆلکلۆریت بۆ دەنووسنەوەو ئیشەکانت لەجیاتی دەکەن.

پاش ئەوەی ئیش‌و کاری چاپخانەمان تەواو کرد، گەڕاینەوە هوتێل، پێشاوێکمان کردو ئینجا لەشەقامی ڕەشید چووینە چێشتخانەی (جمهوری)و نانی نیوەڕۆمان خواردو جارێکی تر

گەڕاینەوە هوتێل. خۆمان کۆکردەوەو گەڕاینەوە شاری هەولێر.

دوای ماوەیەک، ئێوارەیەک لەقاوەخانەکەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووم، شێخانی هاتە ئەوێ، کارتۆنێکی لەسەر شان بوو، نرکەی لێوەدەهات، ئارەقە بەهەموو لەشیدا دەتکایەوە. سڵاوی لێ کردین‌و کارتۆنەکەی لەسەرشانی هێنایە خوارەوە.

غەمگین قاوەچیش پێی گوت: شێخانی ئەم کارتۆنە چی تێدایە؟

گوتی: دانەیەک لەکتێبی ئەو نووسەرانەی تێدایە کەبۆم چاپ کردوون.

ئەمەی گوت‌و کارتۆنەکەی کردەوەو کتێبەکەی منی لەناو دەرهێنا بەناوی (دەرگا)و دایە دەستم‌و گوتی: ئەگەر من نەبوومایە بەساڵێکی تریش ئەم کتێبەت چاپ نە دەبوو.

غەمگین قاوەچی بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئەگەر بەچاوەکانی خۆم نەم دیتبا بڕوام نەدەکرد. ئێمە تا کتێبی (شەش کورتە چیرۆکی کوردی)مان لەڕەقابە وەرگرتەوەو چاپمان کرد، چەند مانگمان پێ چوو. کەچی حەفتەیەکی نەبردووە، تۆ کتێبی ئەم هەموو نووسەرانەت لەڕەقابە تێپەڕاندووەو چاپیشت کردوون؟!

بەر لەوەی شـێخانی وەڵام بـداتەوە گـوتم: بەچـوار سـەتڵ ماستی کانوون کردوویەتی.

ئەویش گوتی: جا ماستی کانوون خۆی هەیە تا ئەو ئیشـە قورسەی پێ بکرێت.

منـیش لەسـەلامو عەلەیـکەوە تـا لەدەرگـا دان بەدرێـژی چیرۆکی ماستەکەو مەنجەڵە فافۆنەکانو پوشو پەڵاشو پارچە خـامو بەنەکەیـم بـۆ گێـڕایەوەو گـوتم: بەم شـێوەیە چـاوی بەرپرسـی ڕەقـابەی گـرتو بەڕێـوەبەری گشـتی ڕۆشـنبیری کوردیشی لەخشتە بردو یەک پیکاب کارتۆنی ئارتو کاغەزی سـپی هەشـتا گرامـیو ئەسـتەرلۆنو دیڤلۆبەرو فلـیمو پلێـتو مەرەکەبـی بەتیـراژی پێـنج هەزار دانە بـۆ هەر کتێبێـک لەو کتێبانە لەئەجهیزەی دەقیقە وەرگرتو لەشـەقامی موتەنەبی بۆ چاپخـانەی ئۆفسـێتی (ئەلحوسـام) بـرد. بەڵام ئەوەی جـێگەی سەرسوڕمان بوو، کتێبەکانی بەکاغەزی بۆری ڕۆژنـامە کەزۆر هەرزان بـوو، بەرگەکەشـی بەکـارتۆتی تایـت چـاپ کردبـوو. کەئەوەم بینـی پـێم گـوت: بـۆچی بەو کـارتۆنو کـاغەزانەی کەلەئەجهیزەی دەقیقە وەرت گرت چاپت نەکردن؟

شـێخانی لەقاقـای پێکەنینـی داو گـوتی: ئەو کەرەسـتانەی کەوەرم گرتن، بەنرخێکی باش فرۆشتمەوە خاوەنی چاپخـانەی

ئۆفسێتی ئەلحوسامو بەپارەیەکی کەمتر لەچاپخانەی لاینۆتایپی (ئەلحەوادس) کتێبەکانم چاپ کردن.

منیش گوتم: تۆ ساختەت لەگەڵ کردووینو کڵاوت لەسەر ناوین.

ئەویش گوتی: باسی جۆری کاغەزو تیراژی چاپکردنم لەگەڵ ئێوە نەکردبوو، ئەگەر وام نەکردبا، چۆن دەمتوانی ئەو کتێبانەتان بۆ چاپ بکەم؟

منیش گوتم: ناکات ژمارەیەکی کەمیشت لێی چاپ کردبێت؟

گوتی: هەر کتێبێک پێنج سەد دانەم لێی چاپ کردووە .

منیش گوتم: هەر هیچ نەبا هەزار دانەت لێی چاپ کردبا.

گوتی: کێ کتێب دەخوێنێتەوەو پارەی پێ دەدات؟

منیش گوتم: ئەگەر کتێبت هێندە لەلا بێ نرخە، بۆچی لێت وەردەگرتینو فریوت دەداین.

بەپێکەنینەوە گوتی: بۆ من عەیبی نییە، نانو ڕوونێکی چەوری تێدایە، بۆ ئێوەش خراپ نییە، من نەبوومایە ساڵێکی تریش لەڕەقابە دەرنەدەچوو، پێشتان چاپ نەدەکرا.

منیش گوتم: کەی بێم کتێبەکانی خۆمت لێ وەربگرمەوە؟

گوتی: جارێ چاوەڕێ بکە، لەوانەیە حەفتەیەکی تر بارەکە بگاتە هەولێر، تەنها چەند دانەیەکم لەکتێبەکان وەک نموونە لەگەڵ دەستی خۆم هێناوەتەوە .

ئەمەی گوتو ڕووی لەغەمگین قاوەچی کردو پێی گوت: ئەم کتێبانەت لەلابێت، بیدەوە خاوەنەکانیانو پێیان بڵێ حەفتەیەکی تر بارەکەم دەگاتو ئەوکات یەکی سەد دانەی تریشییان لەکتێبەکان پێ دەدەم.

کەوای گوت، لەخەفەتان وەخت بوو دڵم ڕاوەستێ. من دوو سەد دینارم پێی دابوو، بەو برە پارەیە بەو مواسەفاتە خراپە هەزار کتێبی پێ چاپ دەکرا. کەچی ئەو باسی سەد کتێبی دەکرد. پێم گوت: ئەوە بەڕاستیتە کەتەنها سەد کتێبمان پێ دەدەیت؟

گوتی: بۆچی چەند پارەتان داومەتێ، تا زیاترتان بدەمێ.

منیش گوتم: ئەگەر بمزانیبا تەنها سەد دانەم لەکتێبەکەم دەدەیتێ، چۆن کتێبەکەم بەتۆ چاپ دەکرد.

ئەویش گوتی: ئەی چۆن لەڕەقابە تێت دەپەڕاند؟

کەوای گوت هیچ قسەم نەما، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەم قورمساغە ڕاست دەکات ئەگەر ئەو نەبا، کتێبەکەم لەڕەقابە دەرنەدەچوو).

# دۆزەخی کتێب

ڕۆژێـک ژوانـم لەگەڵ شـێخانی هەبـوو، تـابەیەکەوە بچـینە شـاری بەغـدا. کـات هەشـتی بەیـانی بـوو، چـوومەماڵیـان لەگەڕەکی مەنتکاوە، لەشەقامی مەلا عوزێر. کەچووم، شێخانی لەگەڵ ژنەکەی پـرتەو بـۆڵەی بـوو، ژنەکەی دەیگـوت: تـۆ دەزانیـت مەنجەڵـم لەمـاڵان خواسـتۆتەوە تـا دانـووی لەنـاو بکوڵێنم، کەچی دارت بۆ نەهێناوم تـادانووەکەی پێ بکوڵێنم، ئێستاش دەڕۆیتو بەجێم دەهێڵیت.

ئەویـش گـوتی: خەمـت نەبـێ کۆمەڵێـک کتێبـی بـێ کەڵکـم لەبەغداد هێناوەتەوە، ئێستا بۆت دەهێنم، ئاگرییان تێ بەردەو دانـووەکەی پێ بکوڵێنە. ئەو کتێبـانە ئەگەر بۆ دانـوو کولانـدن نەبێت، بۆچی باشن؟

ئەمەی گوتو ڕۆیشتە حەوشەی پشتەوەو فەردەیەک کتێبی هێنا، لەنزیک مەنجەڵی دانووەکە دایناو پێی گوت: ئەگەر ئەم کتێبانە بەشی نەکردیت، هەندێک کتێبی تریش لەناو گونیەکەدا هەن، ئەوانیش بێنەو بیانسووتێنە.

ژنەکەی فەردەکەی کـردەوە، ڕێـزمەیەک کتێبـی لەنـاو دەرهێناو هەندێک نەوتی پێدا کردو ئاگری تێ بەردا. کەئەم دیمەنەم بینی سەرم سوڕما، لەدڵی خۆمدا گوتم (لەوانەیە

ناوەڕۆکی ئەم کتێبانە لەدژی کوردو کوردستان بن، بۆیە شێخانی وا بەڕقەوە دەیانسووتێنێ) من لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، شێخانی گوتی: ئەم کتێبانە ئەگەر بۆ دانوو کوڵاندن نەبێت، بۆچی باشن. ئەمەو لەناخی خۆمدا ئەم هەڵوێستەی شێخانیم زۆر گەورە خەملاندو لەدڵی خۆمدا گوتم (پێشینان ڕاستییان گوتووە، کورد بەئیشە نەک بەڕیشە، کێ دەزانێت شێخانییێک کەلەلای خاڵی بەجاش خۆی ناونووس کردووە، کەچی ئەم هەڵوێستە پاکەی کوردانەی هەبێت). لەهەمان کاتدا چیرۆکی بردنی ئازوقەم لەلای شێخانییەوە بۆ پێشمەرگە بیرکەوتەوەو لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەم شێخانییە هەر ڕۆژەو ستایلێکی نوێی کوردایەتیمان پیشان دەدات. ڕۆژێک جیاوازی ناکات لەنێوان جاش‌و پێشمەرگەو ئازوقەی جاشان دەداتە پێشمەرگە، ڕۆژێکیش ئەو کتێبانەی کەلەلایەن ناحەزانەوە لەدژی کوردو کوردستان نووسراونەتەوە، ئاگریان تێ بەردەدات‌و دانوویان پێ دەکوڵێنێ‌و بەبێ دەنگی پێمان دەڵێ ئەو وشانەی کەلەدژی کورد نووسراون بۆ سووتان باشن).

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، غەفار مەخمووری بەژوور کەوت‌و سڵاوی لێ کردین. ڕووی لەشێخانی کردو گوتی: هاتووم کتێبەکانم ببەمەوە.

شێخانیش بەتەوسەوە گوتی: هێشتان زوو نەبوو؟!

ئەویش گوتی: لەبەر دڵسۆزیم نەبا بۆ فۆلکلۆری کوردیو پیرۆزیی بناری قەرەچوغ، بۆ وەرگرتنەوەی کتێبەکان نەدەهاتم.

ئەویش گوتی: تۆ پێت گوتم گشت کتێبەکان بۆ خۆت بێت، لێت وەرناگرم، منیش دامە ژنەکەم بیانسووتێنیو دانووی پێ بکوڵێنی.

کەئەوەی گوت، غەفار مەخمووری لەخەفەتان وەخت بوو جەڵتە لێی بدات، لەتوورەییان برۆیەکانی جووت بوونو نیوچەوانی گرژبووو سەیری منی کردو گوتی: توو ویژدانت، ئەمە ڕەفتاری کەسێکی ئاقڵە؟!

منیش تەماشایەکی شێخانیم کردو هیچ دەنگم نەکرد. لەدڵی خۆمدا گوتم (بەگاڵتە وای پێ دەڵێت، ئەم کتێبانە پەیوەندییان بەکتێبەکانی غەفار مەخمورییەوە نییە). غەفار مەخمووری جارێکی تر قسەکەی دووبارە کردەوەو گوتی: لێم پرسیت پیاوی ئاقڵ کارێکی وەها دەکات. بۆچی قسەیەک ناکەیت، ئەگەر کتێبەکانی تۆشی وەها بسووتاندبوایە، هەروا بێ دەنگ دەبوویت؟

منیش گوتم: شێخانی گاڵتەت لەگەڵ دەکات، چۆن کتێبەکانت دەسووتێنی.

کەوام گوت، شێخانی ڕووی تێ کردمو گوتی: بۆچی نەیانسووتێنم؟ وێڕای ماندووبوونی خۆم، دەیان جار بۆ سەرپەرشتی چاپکردنی چوومەتە شاری بەغداو کۆمەڵێک پارەم خەرج کردووە، کەچی ئەو لەجیاتی ئەوەی دەستخۆشیم لێ بکات، دەڵێ کوالیێتی کاغەزو بەرگەکەی باش نییەو عەیبی لێ دەبینێتەوە. منیش لەڕقان هەموویم سووتاند .

منیش ڕووم لەغەفار مەخمووری کردو پێم گوت: تۆ کتێبەکەی خۆتت بەچاپکراوی بینیوە؟

ئەویش گوتی: حەفتەکەی تر کە لەبەغدا گەڕایەوە، لەگەڵ دەستی خۆی دانەیەک لەکتێبەکەی بۆ هێنام، بەرگەکەی کارتۆنی عادی بوو، تەسەور دەکەی ئێمە ڕێککەتبووین کەبەرگەکەی کارتۆنی ئارت بێتو بەڕەنگاوڕەنگ چاپ بکرێت، کەچی ئەو لەسەر کارتۆنی تایتی سۆمەر بەرگەکەی چاپ کردبوو، ناوەڕۆکەکەشی لەجیاتی کاغەزی سپی لەسەر کاغەزی بۆری ڕۆژنامە چاپ کردبوو، بۆیە پێم گوت کتێبەکانت لێ وەرناگرم.

منیش ڕووم لەشێخانی کردو پێم گوت: ئەو قسانەی مەخمووری دەیانکات راستە؟

گوتی: ئەو تەنها سێسەد دیناری قەڵپی پێ داوم، دەشیەوێ کتێبەکەی بەفول مواسەفات بۆ چاپ بکەم؟!

غەفار مەخمووریش گوتی: هیچ نەبێ ئەو کتێبانەی کەماونو نەتسووتاندوون بۆم بێنە بیانبەمەوە.

شێخانیش گوتی: بڕۆ لای مەنجەڵی دانووەکە، ئەگەر ژنەکەم هەمووی نەسووتاندبێت، بیانهێنە.

پێش ئەوەی مەخمووری بچێتە لای مەنجەڵی دانووەکە، ژنەکەی بانگی شێخانی کردو بەدەنگی بەرز پێی گوت: کتێبەکان بەشی نەکرد، فەردەیەکی ترم بۆ بێنە.

کەمەخمووری ئەمەی گوێ لێ بوو، حەپەسا، دڵی بوورایەوەو کەوتە سەر زەوی.

منیش بەخێرایی لەجامێکدا هەندێک ئاوم هێناو بەدەموچاویم داکردو دەستەکانیم جووڵاند تا هاتەوە سەرخۆیو پێم گوت: ئەوەی ڕوویدا، ڕوویدا، کتێبەکان سووتانو ناگەڕێتەوە، پێویست ناکات خەفەتی لێ بخۆیت، جارێکی تر بەدڵی خۆت چاپیان بکەوە.

## بۆرە

لەماوەی چەند مانگێكدا شێخانی دەیان كتێبی بۆ نووسەرو ڕۆشنبیران چاپكرد، منو عەزیزی مەلا ڕەش یەكێك بووین لەوانەی كەكتێبی بۆ چاپكردین، ڕۆمانی (بۆرە)ی بۆ ئەو چاپكردو كۆمەڵە چیرۆكی (دەرگا) شی بۆ من چاپكرد. یەكی سەد دانەی لەكتێبەكانمان پێداینو ئەوەی تریشی بۆ خۆی گێڕایەوەو بەمەبەستی فرۆشتنو بڵاوكردنەوەی كتێبە چاپكراوەكانی پرۆژەكەی، كتێبخانەیەكی بەناوی (گۆران) لەگۆڕەپانی ڕاوەستانی پاسەكانی گەڕەكی باداوەو بنەسڵاوەو دارەتوو كردەوەو محەمەد ڕەنجاوی شاعیری لەسەر دانا.

ئێوارەیەك لەگەڵ غەمگین قاوەچی لەشەقامی باتە پیاسەمان دەكرد، عەزیزی مەلا ڕەشمان دیت، زۆر دڵخۆش بوو، پێم گوت: مامۆستا دڵخۆش دیاریت، دەڵێی هەواڵێكی خۆشت پێیە؟

گوتی: نەتانزانیوە بۆرە لەبازاڕدا نەماوە، ئەویشیان ئاودیوی ئێران كردووە؟!

ماوەیەكی زۆر بەسەر ڕاپەڕین ڕەت نەبوو بوو، لەوكاتەدا، هەندێك لەبەرپرسانی حیزبەكانی بەرەی كوردستانی بۆ خۆ دەوڵەمەندكردن، خەریكی ئاودیوكردنی قەلابو شۆفڵو ئامێری گەورەو گرانبەها بوون، بەپارەیەكی باش

بەئێرانیەکانییان دەفرۆشتن. کەعەزیزی مەلا ڕەش وای گوت، لەبیری خۆمدا گوتم (زانیومە ئێران گەمارۆی ئابووری لەسەرە، بۆیە ئەو ئامێرو کەلو پەلانە لەخەڵکی هەرێمی کوردستان دەکڕێت. تەنانەت هەردوو حیزبە گەورەکەی کوردستان گشت ئامێرە گرانبەهاکانی بەنداوی بێخمەیان لەسەرۆک عەشیرەتێکی ناوچەکە کڕییەوەو ئاودیوی ئێرانییان کرد. بەڵام نەمزانیوە کتێب ئەو بایەخەی هەبێت تا ئاودیو بکرێت؟!

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، عەزیزی مەلا ڕەش دەستی خستە سەر شانمو گوتی: لەگەڵ تۆمە، خەیاڵت بۆ کوێ ڕۆیشت، بۆچی قسەیەک ناکەیت؟

منیش گوتم: بیرم لەقسەی تۆ دەکردەوە، پێم سەیرە کەدەڵێی ڕۆمانی بۆرە ئاودیوی ئێران کراوەو هیچ دانەیەکی لەبازاڕ نەماوە!

ئەویش گوتی: منیش بڕوام نەدەکرد، بەڵام یەک دانەشی بۆ دەرمان لەکتێبخانەکان نەماوە.

منیش گوتم: تۆ دڵنیایت کەئاودیوی ئێرانیان کردووە؟

گوتی: لەکتێبخانەکان چاوم لێی گێڕا، بەرچاوم نەکەوت. کوڕێکی گەنجی لێ بوو گوتی: خۆت ماندوو مەکە، بەدوایدا

مەگەڕێ، ئەو حیزبانە هەر شتێک پارە بکات، ئاودیوی ئێرانی دەکەن، تەنانەت شووشەی شکاو تێل‌و سیمی کارەباش ئاودیو دەکەن.!

کەوای گوت لەبیری خۆمدا گوتم: (هەتا زووە واچاکە سەردانی شێخانی بکەم‌و لەسۆراغی کۆمەڵە چیرۆکەکەم بپرسم، لەوانەیە کتێبەکەی منیشی ئاودیوی ئێران کردبێت)!

ئەوەبوو غەمگین قاوەچی‌و عەزیزی مەلا ڕەشم بەجێ هێشت‌و یاغر یاغر ڕۆیشتمە لای شێخانی لەکتێبخانەکەی. بەدەم ڕێگاوە لەبیری خۆمدا دەمگوت (ئەو حیزبانە ئەگەر ئەو کتێبانەیان ئاودیوی ئێران کردبێت، کارێکی باشیان کردووە، گەیاندنی کتێبی نووسەرانی باشوری کوردستان بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان ڕێگا خۆشکەر دەبێت بۆ ئاشنابوونی خوێنەری کوردی ڕۆژهەلات بەبەرهەمی نووسەرانی باشوور).

ئەمەو دەیان بیری ترم بەخەیاڵدا دەهات. کاتێک گەیشتمە کتێبخانەکەی شێخانی، بینیم پیکابێکی دوو تەنی لەبەردەم کتێبخانەکەی وەستاوەو حەمباڵەکان فەردەی کتێب لەکتێبخانەکە دەهێننە دەرەوەو لەپیکابەکەی بار دەکەن.

کەچاوم بەم دیمەنە کەوت، لەقسەکەی عەزیزی مەلا ڕەش دڵنیا بووم‌و لەخۆشییان وەخت بوو باڵ بگرم‌و بفرم. لەدڵی

خۆمـدا گـوتم (کـوردانی ڕۆژهەڵات سـەرژمێریان بەرامـبەر کـوردانی ئـێمە سـێ بەرامـبەرە، بەمەش کتێبەکانمـان پـڕ خـوێنەرتر دەبـن‌و بەرهەمەکانمـان بەرەو جیهـانگیری هەنگـاو دەنێـت‌و دەبیـنە نووسـەرێکی نێـودەوڵەتی‌و نـاوو ناوبانگمـان لەگشـت شـارەکانی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان‌و تەواوی وڵاتـی ئێران بڵاو دەبێتەوە).

محەمەد ڕەنجاو لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، شێخانیش فەردەی کتێبەکانی بۆ حەمباڵەکان دەهێنا پێشـەوەو ئەوانـیش بەکۆڵی خۆیان دادەداو دەیانبردە ناو پیکابەکە.

شـێخانی کەچـاوی بەمـن کەوت، گـوتی: چـاک بـوو هـاتی، هێشتان کتێبەکانی تۆیـان بـار نەکـردووە، ئەگەر دەیـانکرێتەوە، خاترت دەگرم.

منـیش لەدڵـی خۆمـدا گـوتم (چیـان لـێ بـکەم؟ لێرە خـوێنەر کەمە، بیـبەنە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان باشـترە، خەڵکـی ئەوێ زیـاتر لەئـێمە تـامەزرۆی خوێنـدنەوەن). لەو کـاتەدا کتێبخـانەی نالووسـیم لەشـاری شـنۆیە بەبیر هـاتەوە، مـاوەیەک لەمەو بەر سەردانی شاری شنۆیەم کردو شەوێک لەماڵی مەلا مـحەمەدی نالووسـی مـامەوەو بەیـانییەکەی بەیەکەوە چـوینە کتێبخـانەکەی، چـاوم بەدەیـان کتێبـی نووسـەرانی باشـووری

کوردستان کەوت، لەوانە تەفسیری قورئانی شێخ محەمەدی خاڵو مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەدینی سەجادیو دەیان شاعیرە کلاسیکییەکانی وەک حاجی قادری کۆییو سالمو نالیو فایق بێکەسو دەیان بەرهەمی ئەدەبیی تر. لەدڵی خۆمدا گوتم (کتێبەکەی منیش دەچێتە پاڵ ئەو کتێبانەو خوێنەری کوردی ڕۆژهەڵات پێی شاد دەبن).

لەو بیرکردنەوەیەدا بووم، شێخانی بەدەنگێکی بەرز گوتی: تەنها ئەو کتێبانەی تۆ ماون باری بکەن، ئەگەر نایانکڕیتەوە تا بیبەن.

منیش گوتم: کارێکی چاکت کردووە کەئەو کتێبانە ئاودیوی ئێران دەکەیت، بەم کارەت گەورەترین خزمەتی وشەی کوردیو خوێنەرانی کوردی ڕۆژهەڵاتو ئێمەی نووسەرانی باشوور دەکەیت.

کەوام گوت، بەسەرسوڕمانەوە گوتی: تۆ چی دەڵێیت، ئێرانی چیو خزمەتی وشەی کوردیو خوێنەرانو نووسەرانی چی!

منیش گوتم: ئەوە نییە ئەو کتێبانە ئاودیوی ئێران دەکەیت؟

بەپێکەنینەوە گوتی: بۆچی کتێب قەلابو شۆفڵە تائاودیو بکرێت، کێ پارە بەکتێب دەدات؟

منیش گوتم: ئەی بۆ کوێی دەبەن؟

گوتی: هەموو کتێبەکانم بەتێکڕا دانەی بەسەد فلس فرۆشتۆتە کارگەی کرێمەستی عەدنان.

کەئەوەم گوێ لێ بوو، حەپەسام. گوتم: ئەوان کتێبییان بۆچییە؟

گوتی: کاغەز گرانە، لەجیاتی ئەوە موسێک لەکەعبەکەی دەدەن و کاغەزەکەش دەکەنە دوو پارچەو بۆ پێچانەوەی کرێمەستی بەکاری دەهێنن.

## پڕفرۆشترین ڕۆژنامە!!

ماوەیەک لەڕۆژنامەی (هەرێمی کوردستان) کارم دەکرد، بەرپرسی لاپەڕەی (یاساو کۆمەڵ) بووم. ڕۆژنامەکە زمانحاڵی وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو. بەقەوارەیەکی مام ناوەندی، بەشانزە لاپەڕە دەردەچوو. وێڕای ئەم ڕۆژنامەیە چەندین ڕۆژنامەی تریش لەهەرێمی کوردستان دەردەچوون. کێبڕکێیەکی گەرمو گوڕ لەنێوان ڕۆژنامەکاندا هەبوو، لەسەر ژمارەی خوێنەرانو پڕفرۆشیدا، وەک پێوەرێک بۆ باشیو خراپی ڕۆژنامەکەو کاریگەریی لەسەر کۆمەڵگەدا.

هەفتەی جارێک پێش دەرچوونی ژمارەی نوێی ڕۆژنامەکە، سەرنووسەری ڕۆژنامەکە کۆبوونەوەی بەدەستەی نووسەرانو پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە دەکرد، بۆ تاوتوێکردنی بابەتەکانی ژمارەی داهاتوو و هەڵسەنگاندنی ژمارەی ڕابردوو. ئەمەو ڕاو سەرنجی خۆشی گۆشە هەمیشەییەکانی ڕۆژنامەکە پێ دەگوتینو ئەگەر ڕاسپاردەیەکی وەزیری ڕۆشنبیریش هەبوایە پێی ڕادەگەیاندین.

جارێک جیاواز لەکۆبوونەوەکانی پێشوو، لەناوەڕاستی هەفتەدا، بۆ بابەتێکی گرنگ ئێمەی کۆکردەوە. کۆبوونەوەکە دەستی پێ کرد، سەرنووسەر بەدەموچاوێکی گەشو

خۆشحاڵییەوە هاتە ناو كۆبوونەوەكەو لەخۆشییان ئاو لەدەمی ڕانەدەوەستا. دوای سڵاوكردن، ڕووی تێكردین‌و گوتی: خۆشك‌و برایان دەزانن بۆچی بەدوامدا ناردوون؟!

دەتگوت سروودی نیشتیمانی دەڵێینەوە، هەموومان بەیەك دەنگ گوتمان بۆچی كۆتكردوینەتەوە؟

تەماشایەكی كردین‌و هیچ دەنگی نەكرد. جگەرەیەكی داگیرساندو خستییە سەر لێوەكانی‌و قومێكی درێژی لێداو پێكەنی.

منیش لەدڵی خۆمدا گوتم (لەوانەیە ئەو ڕاپۆرت‌و بابەتانەی لەناو ڕۆژنامەكەدا بڵاومان كردوونەتەوە، كاریگەرییان لەسەر بڕیارەكانی حكوومەت‌و پەرلەمان‌و كۆمەڵگەدا هەبووبێت، بۆیە لەخۆشییان قسەی پێ ناكرێت). ڕووم تێ كردو پێمگوت: لەوە دەچێت ڕاپۆرت‌و بەدواداچوونە ڕۆژنامەوانییەكانمان كاریگەرییان لەسەر كاروچالاكی‌و بڕیارەكانی حكومەت‌و پەرلەمان هەبووبێت؟!

ئەویش بێ دوو دڵی گوتی: بێ گومان كاریگەریی دەبێت.

كەگوێم لەوشەی بێ گومان بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم (مادام وشەی بێ گومانی بەكار هێنا، فشەیەو لەوانەیە پلەیەكی

وەزیفی گەورەترییان پێی دابێت، ئێمەی کۆکردۆتەوە، دەیەوێ ماڵئاواییمان لێ بکاتو دەست لەکار هەڵبگرێت)

سەرم خستە ژێر گوێی جێگری سەرنووسەرو پێم گوت: هیچت زانیوە؟

گوتی: منیش وەکو ئێوە هیچی لێ نازانم.

گوتم: من بیرم بۆ شتێک دەچێت.

گوتی: چییە؟

گوتم: لەوانەیە وەزیفەیەکی بەرزتری وەرگرتبێتو گواسترابێتەوە بۆ دیوانی وەزارەت.

کەوام گوت، بزەیەک هاتە سەر لێوەکانیو لەگەڵ قسەکانمدا موچڕکی خۆشی بەلەشیدا دەهات، بەنەرمی پێکەنیو هیچ دەنگی نەکرد.

کەئەم دیمەنەم بینی، لەدڵی خۆمدا گوتم (هێشتان هیچ نەبووەو نازانین چارەنووسی سەرنووسەر بەچی دەگات، کەچی ئەو برادەرە خۆی بۆ جێگەکەی ئەو داناوە)

من لەو بیرکردنەوەیەدا بووم، سەرنووسەر ڕووی تێ کردمو گوتی: خەیاڵت بۆ کوێ ڕۆیشتووە، بیر لەچی دەکەیتەوە؟

گوتم: ئێمەت خستۆتە مەراقەوە، بیر لەقسەکانت دەکەمەوە، دەکرێ پیرۆزباییت لێ بکەم؟

گوتی: تەنها من نا، ئێوەش شایەنی ئەو پیرۆزباییەن.

کەوای گوت، لەدڵی خۆمدا گوتم (دیارە مووچەکانمان زیادی کردووە، بۆیە وادەڵێ). ڕووم تێی کردو پێم گوت: دیارە مووچەکانمان بەرز بۆتەوە؟

گوتی: وامزانی تۆش وەکو من شتێکت زانیوە، بەڵام زۆر دوور کەوتیتەوە، پەیوەندیی بەبەرزکردنەوەی مووچەکانتانەوە نییە، زۆر لەوە گەورەترە، ئەگەر بزانن، لەخۆشییان وەکو من شاگەشکە دەبن.

جێگری سەرنووسەریش گوتی: زیاتر بەمەراقمان مەخەو پێمان بڵێ.

ئەویش گوتی: ماوەیەکە لەلایەن دەزگای شێخانی بۆ دابەشکردنی چاپەمەنییەکان، هیچ ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەمان ناگەڕێتەوە. دوێنێ سەردانی کتێبخانەکانم کرد، چاوم گێڕا، ڕۆژنامەکانی خۆمانم لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکانو پێش جامخانەکان نەبینی، تەنانەت یەک دانەشی بۆ دەرمان نەمابوو، لەوە دەچێ هەمووی فرۆشرابێت.

لەدرێـــژەی قســـەکانیدا گــوتی: خوشــکانو برایـــان، ڕۆژنامەکەمـــان تـــاکە رۆژنـــامەیە کەهەمـــوو ژمارەکـــانی بفرۆشرێنو هیچی نەگەڕێتەوە.

ئەمەو ئاماژەی بەناوی چەند ڕۆژنامەیەک کرد، کەلەلایەن حیزبەکـانی کوردســتان دەردەچــن گــوتی: ئەو ڕۆژنامـــانە هەرچەنـــدە تەمەنییـــان زۆر لەتەمەنـــی ڕۆژنـــامەکەی ئـــێمە گەورەترەو ماوەیەکی زۆرە دەردەچنو بودجەیەکی زەبەلاحو کارمەندێکی زۆریش کارییان تێدا دەکەن، کەچی ژمارەیەکی کەمییـــان لـــێ دەفرۆشـــرێتو لەســـەر ڕەفەی کتێبخانەکـــان هەتاویان لێ دەداتو لەکۆتایی هەفتەشدا زۆربەی ژمارەکانی دەگەڕێنەوە.

کەوای گــوت، ســـەرم ســـوڕما، لەبیـــری خۆمـــدا گـــوتم (ڕۆژنـامەکەی ئێمە لەچاو هەندێک لەو ڕۆژنامـانەی کەباسـی کـردن، زۆر لاواز بـوو. ڕۆژنـامەی ئەو حیزبـانە بـودجەیەکی گەورەیـــان لەبەر دەســـت دایەو پاداشـــتێکی زۆر بـــۆ خـــاوەنی بـــابەتە بڵاوکراوەکـــان خەرج دەکەن، بـــۆیە ئەو نووســـەرانەی بەناوبانگو خاوەن ئەزموونن لەو ڕۆژنامـانەدا نووسینەکانیان بڵاو دەکەنەوە نەک ڕۆژنامەکەی ئێمە).

لەڕاستیدا وێڕای ئەوەی ئەندامی دەستەی نووسەران بووم، لەهەمان کاتدا گۆشەیەکیشم بەناوی (یاساو کۆمەڵ) لەڕۆژنامەیەکی یەکێک لەو حیزبە گەورانە هەبوو، لەڕوانگەی یاساییەوە لەسەر بابەتە کۆمەلایەتییەکان دەمنووسی. ڕووم لەسەرنووسەر کردو پێم گوت: تۆ دڵنیایت کەهیچ ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەمان نامێنێتەوەو هەمووی دەفرۆشرێت؟

گوتی: منیش وەک تۆ کەئەم دیمەنەم بینی، بڕوام بەچاوەکانی خۆم نەکردو لەخاوەن کتێبخانەکانم پرسی، گوتیان هیچ ژمارەیەکمان لەلا نەماوە.

ئەوەی ڕاستی بێت، وێڕای ئەوەی کەسەرنووسەر بەدڵنیاییەوە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەڕۆژنامەکەمان پڕ خوێنەر بووەو هیچ ژمارەیەکی لەکتێبخانەکان نامێنێتەوە. بڕیارمدا سەردانی شێخانی بکەمو لێی بپرسم ئایا هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکەمان دەفرۆشرێت، یان نا؟ بۆیە کەکۆبوونەوەکەمان تەواو بوو، پێش ئەوەی بگەڕێمە ماڵەوە، ڕۆیشتمە لای شێخانیو پێم گوت: دەڵێی بازاڕی کتێبو ڕۆژنامە باشتر بووە، ماوەیەکە ڕۆژنامەکەمان هیچ ژمارەیەکی ناگەڕێتەوە؟

کەوام پێ گوت، بەپێکەنینەوە گوتی: کێ پارە بەڕۆژنامەو کتێب دەدات، بۆچی خوێنەر هەیە تا باشتر بێت؟

منیش گوتم: مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

گوتی: دەبێ مەمنوون بن لەهەر ژمارەیەکی نوێی ڕۆژنامەکەتان حەوت دانەی لێ بفرۆشرێت.

ئەمەو ئاماژەی بەیەک دوو ڕۆژنامەی تریش کرد، کەلەلایەن حیزبەکانەوە دەردەچوون، گوتی: ئەو ڕۆژنامانەش وەزعییان لەڕۆژنامەکەی ئێوە باشتر نییە، هەر ژمارەیەکی نوێی کە دەردەچێت، بەترەتر دە پانزە ژمارەی لێ دەفرۆشرێتو ئەوەیشی کەدەمێنێتەوە، لەکۆتایی هەفتەدا بۆیان دەگەڕێنمەوە.

منیش گوتم: سەرنووسەری ڕۆژنامەکەمان دەڵێ هیچ ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەمان ناگەڕێتەوەو هەر هەمووی دەفرۆشرێت.

کەوام گوت، لەقاقای پێکەنینی داو گوتی: ڕاست دەکات، هیچی ناگەڕێتەوەو هەر هەمووی دەفرۆشرێت، ئێوە بەختێکی باشتان هەیە، ڕۆژنامەکەتان قەوارەی گەورەیەو شانزە لاپەڕەشە، بۆیە لەکۆتایی هەفتەدا، ئەوەی دەمێنێتەوە، هەمووی دانەی لەسەر دینارێک دەفرۆشمە ئوتوچییەکان، بۆ پێچانەوەی

ئەو جلو بەرگانەی کەئوتویان دەکەن، بەکاری دەهێنن، بەڵام ڕۆژنامەکانی تر لەبەر ئەوەی ژمارەی لاپەڕەکانیان کەمترە، پارەی پێ نادەن.

## شارەوانیو کتێب

ڕۆژێک لەبازاڕی تەیراوە لەدوکانی تەڕەفرۆشەکان خەریکی کڕینی سەوزە بووم، کتێبی کۆمەڵە چیرۆکێکم بینی، سەوزە فرۆشەکە بەدەستییەوە بوو، پرتەو بۆڵەی بوو، جوێنی بەشارەوانی دەدا، لەگرتنی کتێبەکە بەسەراوقوونی، بۆم دەرکەوت کەسێکی نەخوێندەوارە .

پێم گوت: کێشەت لەگەڵ ئەم کتێبە چییە؟

گوتی: حکومەت شارەوانی تێ بەرداوین، ڕۆژی بەناوێک پارەمان لێ دەستێنێ، ڕۆژێک بەناوی سەرپێچیو ڕۆژێکیش بەناوی خۆڵو خاشاک فڕێدان، بەمە چاویان تێر نەبووە، ئێستاش بەناوی کتێب پارەمان لێ بەردەدەنەوەو وەکو مانگا دەماندۆشن.

کە وای گوت، یەکسەر شێخانیم بیرکەوتەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم: (هەبێو نەبێ ئەم ئاین و ئۆینە لەژێر سەری ئەم تەڵەکە بازەوەیە، ڕۆژێک کتێب بەپیرەمێردو پیرەژنە داماوەکانی چاودێریی کۆمەڵایەتی ساغ دەکاتەوە، ڕۆژێکیش بەناوی شارەوانی بەتەڕەفرۆشو کاسبکارانی دەفرۆشێت).

کتێبەکەم لەدوکاندارەکە وەرگرتو چاوێکم پێدا خشاند، هیچ پەیوەندی بەشارەوانیەوە نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێ

لەچاپخانەی شارەوانی چاپ کرابوو، پێم گوت: ئەگەر تۆ ناتەوێ بەنرخی خۆی لێت دەکڕمەوە.

کەوام پێ گوت، بێ سێو دوو، کتێبەکەی دایە دەستمو گوتی: من خەتو قەڵەمم نییە، منداڵەکانیشم ساوانە، سەری لێ دەرناکەن، مەمنوونیشت دەبم تۆ بیبەیت، حەزدەکەی پارەش مەدە، ئەو دینارە بەقوربانی تۆ بێت.

کتێبەکەم لێ وەرگرتو چوومە کتێبخانەی شێخانی، کتێبەکەم پیشان داو پێم گوت: ئەم کتێبەم لەسەوزە فرۆشێک کڕیوەتەوە.

هێشتان قسەکانم تەواو نەکردبوو، گوتی: ئەم کتێبە من چاپم کردووە، بۆچی لەخۆمت نەکڕی، خاتریشم دەگرتیت.

منیش گوتم: هەر زوو زانیم ئەو کردەوە ناشیرینانە هی تۆن، لەتۆ بەولاوە کەسیتر بیر لەکاری وەها قۆڕ ناکاتەوە.

کەوام پێ گوت، لەقاقای پێکەنینی داو گوتی: ئەم کتێبەش وەکو کتێبەکەی تۆ قەوارەکەی زۆر بچووکەو ژمارەی لاپەڕەکانیشی کەمن، بۆیە کارگەی کریمەستی پارەی پێ نەدا، دەنا لەگەڵ کتێبەکانی تر ئەمانەشم پێ دەفرۆشتو ناچار نەدەبووم بەناوی شارەوانی بەسەر تەڕەفرۆشو میوەفرۆشو کاسبکاران دابەشییان بکەم.

منیش گوتم: کەسێک نەبوو دوو شەقت تێ هەڵداتو پێت بڵێ: شارەوانی چ پەیوەندییەکی بەدابەشکردنی کتێبی ئەدەبیەوە هەیە؟

گوتی: هەندێکیان زۆر ئاقڵ بوون، بەتایبەتی ئەوانەی خوێندەواربوون، کتێبەکەیان لێ وەرنەدەگرتم و داوای نووسراویان لێ دەکردمو دەیانگوت: هەرگیز شتی وەها نابێت، شارەوانی چ پەیوەندییەکی بەکتێب فرۆشتنەوە هەیە؟ بەڵام من لەوان زیرەک تر بووم، بەرگی پشتەوەی کتێبەکەم پیشان دەدان کەلەسەری نووسرابوو (لەچاپخانەی شارەوانی چاپ کراوە)و پێم دەگوتن: نووسراوی شارەوانیتان بۆچیە، ئەگەر بڕوام پێ ناکەن، ئەم نووسینە بخوێننەوە، ئینجا دەزانن کە من لەخۆمەوە نەهاتوومەو بەفەرمانی سەرۆکی شارەوانی ئەم کتێبانەتان پێ دەفرۆشم.

# ئەنفالێکی تر

پـاش ئەوەی گەلـی کوردسـتان ڕاپەڕینـی کـردو شـاری هەولێـریش وەک شـارەکانی تـری کوردسـتان لەدژی ڕژێـم ڕاپەڕی، بەڵام هێنـدەی نەبـردو جـارێکی تـر گشـت شـارەکان لەلایەن سوپای دەوڵەت کۆنترۆل کرایەوە.

ئەو ئێوارەیەی کەسـوپای حکوومەت گەیشـتە شـارۆچکەی پردێو تانکو زرێپۆشەکانی بەرەو شاری هەولێر بەڕێکەوتن، لەکتێبخانەی شێخانی دانیشـتبووم، باسـی بـارودۆخی سیاسـیی ناوچەکەمان دەکرد. کوڕێکی گەنج لەکتێبخانەکە بوو، تەماشـای کتێبەکـانی دەکـرد، کەگـوێی لەئـێمە بـوو بەو پەڕی متمـانەوە باسـی خـۆڕاگریی خەڵکـی کوردسـتان دەکەیـن، گـوتی: لەقسـەکانتان دیـارە ورەتـان بەرزەو زۆر متمانەتـان بەخۆتـان هەیەو دڵتان بەو ئازادییە خۆشە کەلەسـایەی ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان هاتۆتە دی؟

منیش گوتم: بۆچی وا دەڵێی، شتێکت زانیوە؟

گـوتی: لەدوێنـێ ئێـوارەوە زۆربەی بەرپرسـەکان ئێرەیـان بەجـێ هێشـتووەو خۆیـانو خانەوادەکانیـان ڕۆیشـتوونە بـۆ شـارۆچکەکانی نزیـک سـنوورو بەدرۆ شـاخدارەکانیان خەڵکـی ڕەشو ڕووتو ساویلکە چەواشە دەکەن.

منیش گوتم: گوێم لێ بووە شاری کەرکووک گیراوەتەوەو هێزەکانی گاردی کۆماری سەربازگەی وەلیدیان گرتۆتەوە. بەڵام شاری هەولێر جیاوازە، شاری هۆلاکۆ بەزێنەو بەئاسانی خۆی بەدەستەوە نادات.

کوڕە گەنجەکە گوتی: بەداخەوە ئەوە تەنها قسەیە، هیچ سەرچاوەیەکی متمانە پێکراوی مێژوویی ڕەسەن ئەمەی نەسەلماندووە.

ڕووم لەشێخانی کردو پێم گوت: ئەو کوڕە گەنجە دیارە شتێکی زانیوە بۆیە وا دەڵێ، تا نەقەوماوەو سوپای ڕژێم نەگەیشتۆتە سەرمان، باوەکو ئەو بەرپرسە حیزبیانە مشووری خۆمان بخۆین‌و ژن‌و منداڵەکانمان بگەیەنینە دەرەوەی شار.

کەوام پێی گوت، دەستی خستەوە ناو گیرفانی‌و ناسنامەیەکی دەرهێناو بەپێکەنینەوە گوتی: پێشینان بەلاش نەیانگۆتییە (جاشایەتی‌و پاشایەتی)، من ڕاناکەم، ئەم ناسنامەیەیان پیشان دەدەم‌و دەڵێم جاشم.

منیش گوتم: بێ ئەقڵ مەبە، خاڵت یەکێکە لەو سەرۆک جاشانەی کەلەحکومەت هەڵگەڕاوەتەوەو چۆتە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان. ئەگەر بزانن تۆ خوارزای

ئەویــت، پێســتت دەبەنە دەباغخــانەو تــۆڵەی خاڵیشــت لەتــۆ دەکەنەوە.

ئەویش گوتی: هێزی ڕاکردنم نییە، لەماڵی خۆم دادەنیشم، چی دەبێت با ببێت .

ئێمە لەو قسانەدا بووین، بووە پشێویو شوفێری پاسەکان زۆربەیان گۆڕەپانەکەیان بەجێ هێشتو بەبەتاڵی ڕۆیشتنەوە.

منیش ماڵئاواییم لەشێخانی کردو بەخێرایی خۆم گەیاندەوە مــاڵیو لەگەڵ دراوســێکانم چــاودێری بــارودۆخەکەم دەکــرد. کاتێــک دەبابەکــانی ســوپا گەیشــتنە شــارۆچکەی قوشــتەپەو هەنــدێک گــولله تۆپییــان لەشــاری هەولێــر گــرت، بڕیارمــدا کەڕابــکەمو لەگەڵ خــانەوادەکەم بچیــنە شــارۆچکەی هەریــرو مــاوەیەک لەوێ بمێنینەوە تــا بــارو دۆخەکە ئاسایی دەبێتەوەو مەترسی لەسەر ژیانمان نامێنێ.

بەهەرحــاڵ، دوای مــاوەیەک، پــاش ئەوەی بــارودۆخەکە ئاسایی بۆوەو حکومەت لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندن بڵاوی کردەوە کەدەســت لەکەس نــاداتو داوای کــرد ئەوەی ڕۆیشــتووە بگەڕێتەوە سەر ماڵو حاڵی خۆی.

ئەوەبوو ئێمەش گەڕاینەوە، پیاوەکانی ڕژێم زۆر لەناو شار نەمــانەوەو دوای مــاوەیەکی کەم بەبڕیــارێکی حکــومەت گشــت

دامودەزگــــا فەرمیەکــــانی خــــۆی بــــۆ دەرەوەی ســــنووری پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان گوێزایەوەو جارێکی تر ئازاد بووین.

ڕۆژێک بەخەیاڵمدا هات بچمە بازاڕو سەردانی کتێبخانەکەی شــــێخانی بــــکەم. کەچــــووم، بینــــیم دەرگــــاکەی شــــکابوو، کتێبخانەکەی تالان کرابوو، لەهەندێک پەڕە کاغەزو کتێبی دڕاو بەولاوە هیچی تر نەمابوو. لەدڵی خۆمدا گوتم (دیارە شتێکی خراپی بەسەر هاتووە، بۆیە کتێبخانەکەشی تالان کراوە).

گەڕامەوە چایخانەی مەجکۆو لەبرادەرە نزیکەکانیم پرسی، کەس هەواڵی نەدەزانی، گوتیان دوای گرتنەوەی شاری هەولێر لەلایەن ســــوپای ڕژێــــمەوە چاویــــان پێــــی نەکەوتــــووەو هــــیچ سۆراغێکی نازانن.

بەم شێوەیە، شێخانی تاماوەیەکی زۆر دەنگو باسی نەماو لەهیچ شوێنێک دیار نەما. ڕۆژێک لەبازاڕبووم، شێخانیم بینی، هــاتە لامو گــوتی: خــۆزگە بەقســەی تــۆم کردبــاو شــارم بەجــێ هێشتبا، وەکو ئەو خەڵکە ڕۆیشتبامو نەگەڕابامەوە.

منــیش گــوتم: مــاوەیەکی زۆرە دیــار نیــت، شــتێکی خراپــت بەسەر نەهاتووە؟

گوتی: ئەنفال کرام، لەوە خراپتر چی دەبێت!

کەوای گـوت، بـڕوام پێـی نەکـرد، لەدڵـی خۆمـدا گـوتم (پرۆسـەی ئەنفـال دیـارەو هەمووومـان دەزانـین کەیـیو چۆنو بەچەند قۆناغ ڕژێمی بەعس خەڵکی بێ تـاوانی کوردی ئەنفال کـرد. بۆچی دەبێت دوای ئەو هەمـوو مـاوەیە، تەنهـا شـێخانی ئەنفال بکات، خۆ ئەویش نەبۆتە خولەپیزە تاڕقی لێ هەڵگرن)!

پێم گوت: بۆم باس بکە چۆن ئەنفالیان کردیتو چۆنیش ئازاد کرایت؟

گوتی: وەکو پێم گوتی، بەو ناسنامەی جاشێتیە هەڵخەڵەتـام کەلەگیرفانم بوو، لەمـاڵی خۆمـان مـامەوەو دەرنەچووم. کاتێک شـاری هەولێـر گیـرایەوەو سـوپای گـاردی کۆمـاری بەنـاو گەڕەکەکانـدا بڵاوبـوونەوە، تیمێکییـان هـاتنە گەڕەکەکەی ئێمەو مـــاڵ بەمـــاڵ دەیانپشـــکنیو بـــێ لەچەکو تەقەمەنـــی، هەر گەنجێکیشیان بدیتبا لەگەڵ خۆیان دەیانبرد. ئەوەبوو خەڵکێکی زۆریـان بەڕەشـگیری گـرتو هەموومانیـان بـردە سـەربازگەی هەولێرو لەبەیـانییەوە تـا درەنگـی شـەو گوللەتۆپو سـندووقی فیشـەکیان پـێ دەگواسـتینەوە. چەنـد ڕۆژێـک بەبـێ نـانو ئـاو ئێمەیان بەزیندانیکراوی هێشتەوە، دوایـی ئێمەیـان بـردە شـاری بەغدادو لەفەرمانگەی ئەمنی ڕەزوانییە زیندانییان کردین.

منیش گوتم: ژمارەتان چەند کەس دەبوو؟

گـوتی: بەپێـی ئەو سـەرژمێریەی کەڕۆژانە لەئەمنـی عـامە بۆیـان دەکـردین، دوو هەزار کەس دەبـووین، بـێ لەسـەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزیو تەشریعیو ئەمینداره گشتییەکانو هەر سێ پارێزگارەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

کەوای گـوت، سـەرم سـوڕما، گـوتم: ئەوە گوتمـان ئێوەیـان بەتێکدەرو خیانەتکـار لەقەڵەم داوە، ئەی ئەو هەمـوو بەرپرسـە باڵایانەیان بەچ ناوێکو بەچ تۆمەتێک گرتووە؟!

گـوتی: پـێش ئەوەی مـن بەربـدەن، ئەوانییـان ئـازاد کـرد. ئەوانیـان بەترسـنۆک لەقەڵەم دابـوو، لەسـەر فەرمـانی سـەدام حوسـێن ئەوانیـان گرتبـوو، چـونکە بەرگرییـان لەشـارەکان نەکردبوو.

منیش گوتم: هەمووتان ئازاد کران؟

گـوتی: ئەو دوو هەزار کەسـەی لەگەڵ مـن گیرابوون، تەنها منیان ئازاد کردو ئەوانی تریان هەمو کوشتن.

منـیش گـوتم: بـێ گومـان سـوودت لەو ناسـنامەی جاشـێتیە وەرگرتووە کەخاڵت بۆی کردبوویت .

گـوتی: خۆزگە بەقسـەی تۆم کردباو شـارم بەجـێ هێشـتبا. من بەچی بزانم کەئەوان هەموو شـتێک لەبـارەی خـاڵم دەزانـن، ئەوان دەیـانزانی خـاڵم تەقەی لەبارەگاکـانی ڕژێـم کـردووەو

چـۆتە پـاڵ هێزەکـانی پێشـمەرگە، بـۆیە کاتێـک ناسـنامەکەم پیشاندان، زیاتر لێم تورە بوون. یەکێک لەئەفسەرەکان تا هێزی لەبەردا بـوو دەمـانچەکەی کێشـا بەسـەرمداو زۆری نەمـابوو سەرم بتەقێنێ، زۆر جوێنی پیسـی پێدام، گوتی (ئێوەی کورد هەمووتان گێرە شێوێنو تێکدەرو خیانەتکارن، وا دەزانن ئێمە نازانین ئەگەر ئێوەو سـەرۆک جاشـەکانتان خیانەتتـان نەکردبـا، هەرگیـز ئەو بەکرێگیـراوانەی زایـۆنیزمو ئەمریکا هیچییـان پێ نەدەکرا).

منیش گوتم: ئەی چۆن ڕزگارت بوو؟

گوتی: ئەگەر خودا ئەجەلی کەسێک نەهێنێ، نامرێت.

منیش گوتم: چۆن؟

گوتی: هەموو ڕۆژێک سـێ جـاران سـەرژمێرییان دەکـردین، ڕۆژێـک دەنگـۆی ئەوە بڵاوبـۆوە کەبـۆ شـوێنێکی نادیـار دەمـانبەن، لەکـاتی ناونووسـیندا یەکێـک لەو ئەفسـەرانەی کەئێمەیان ناونووس دەکرد، کەگەیشتە لای من، لەتەپڵی سـەرم تا قاچەکانم، زۆر بەوردی لێمی دەڕوانی. منیش لەدڵی خۆمدا لەخـودا دەپـاڕامەوەو نـزام دەکـرد ئەم بەڵایەم لەسـەر لابداتو ڕزگارم بکات.

لەوکـاتەدا، دوای وردبـوونەوەیەکی زۆر لەسـەرو سـیمام، ئەفسـەرەکە پێـی گـوتم: تـۆم لەشـوێنێک بینیـوە، بەڵام بیـرم ناکەوێتەوە، نازانم کەیی‌و لەکوێ تۆم بینیوە .

منـیش بەبـێ ئەوەی بیناسـم، گـوتم: سـیمای تـۆش لای مـن غەریب نییە، بەڵام نازانم لەکوێ یەکدیمان بینیوە.

کەئەوەم گوت، زیـاتر لـێم نزیـک بـۆوەو بەدیقەت تەماشـای کـردم‌و گـوتی: موسـلیح جەلالـی دەناسـیت؟ منـیش گـوتم: بەڵـێ دەیناسـم، بەڕێـوەبەری گشـتیی دەزگـای ڕۆشـنبیری کـوردیەو لای ئەو کـارم دەکـرد، بڵاوکراوەکـانی ئەو دەزگـایەم لەشـاری هەولێـر دابەش دەکـرد. کەئەوەم گـوت، وەکـو ئاوێـک بەئـاگر دابکەیت، هەموو شتێک گۆڕا، دەسـتی خسـتە سـەر شـانەکانم‌و منـی لەڕیـز بـردە دەرەوەو دوای ناونووسـکردنی ئەوانـی دی، هاتەوە لام‌و منی لەگەڵ خۆی بردە ژوورەکەیی‌و نووسـراوێکی بۆ کردم‌و ئازادی کردم.

منیش گوتم: ئەدی چارەنووسی ئەوان چی بەسەر هات؟

هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشـاو گـوتی: بەداخەوە هەموویـان بێ سەرو شوێن کران .

## کتێبێك‌و دوو ڕەنگ

ئێوارەیەک لەقاوەخانەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووم، شێخانی هات، دوو ڕێزمە کتێبی بەدەستەوە بوو، ڕێزمەیەک ڕەنگی بەرگەکانی زەرد بوو، ڕێزمەکەی تریش ڕەنگییان سەوز بوو، لەقورسییان شانی لەگەڵ خوار ببوو. غەمگین قاوەچی پێی گوت: ئەمجارە کتێبت بۆ کێ چاپ کردووە؟

گوتی: ئەم کتێبەم بۆ خۆم چاپ کردووە، درەختی خانەوادەو کەسایەتییەکانی هۆزی شێخانیم تێدا نووسیوەتەوە .

غەمگین قاوەچی پێی گوت: بێ گومان ئەم کتێبانەت بۆ ئێمە هێناوە؟

گوتی: ئەو کتێبانە بەپارە دەدەمە ئەو کەسانەی کەناویان تێدایە، بەڵام بەشی ئێوەشی تێدایە.

سەیری کردین‌و بەپێی ژمارەی ئێمە هەندێک کتێبی لەناو ڕێزمەکە دەرهێناو بەسەرمان دابەشی کردو گوتی: پێم خۆشە ڕاو سەرنجی خۆتانم پێ بڵێن تا لەچاپی دووەمدا سوودیان لێ وەربگرم.

منیش گوتم: من تێبینیێکم هەیە، بۆچی ڕەنگی بەرگی کتێبەکان دوو جۆر ڕەنگە؟

گوتی: بەئەنقەست بەرگی هەندێکیانم زەرد کردووەو هەندێکی تریش سەوز.

منیش گوتم: ئەمە بابەتێکی هونەرییەو بەزەوقی منو تۆ نابێت، دەبوو بەرگی هەموو کتێبەکان یەک ڕەنگ بووایە.

ئەویش گوتی: ئەوە بۆ من لێ گەڕێن، ئیشی خۆم پێیەتی.

غەمگین قاوەچی کتێبەکەی دایەوە دەستیو پێی گوت: کتێبەکەی من ڕەنگی بەرگەکەی سەوزە، کتێبێکی ترم بدێ، ڕەنگی بەرگەکەی زەرد بێت، وەکو کتێبی ئەو برادەرانە.

ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: تۆ یەکێتیت خۆشتر دەوێت، بۆیە ڕەنگی سەوزم بۆت داناوە.

غەمگین قاوەچی گوتی: بەچی دەزانیت چ حزبێکم زیاتر لەوانی دی خۆشتر دەوێت؟

گوتی: ماوەیەک لەڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) کارت کردووەو ئێستاش سالانە لەفیستیڤاڵی گەلاوێژ بانگت دەکەن.

خەمەش کتێبەکەی دایەوە دەستیو گوتی: من نە لەوانمو نە لەوان، لەفاتۆکەی باداوانم، با بۆ خۆت بێت، بەڵکو هەوادارێکی پارتی سوودی لێ وەربگرێت.

منیش گوتم: پێت نەگوتین بۆچی ڕەنگی زەردو سەوزت بۆ کتێبەکەت هەڵبژاردووە؟

گوتی: ئەم کتێبانەم بۆ ئەو کەسانە چاپکردووە کەلەهۆزی شێخانین، بەپارەیەکی باش پێیان دەفرۆشم، ئەو کەسەی یەکیتی بێت، کتێبێکی سەوزی دەدەمێ، ئەوەی کەپارتیش بێت، کتێبێکی زەردی دەدەمێ.

منیش گوتم: چی دەبوو ئەگەر هەموویان یەک ڕەنگ بوونایە؟

بەپێکەنینەوە گوتی: کەسیان نازانن من چ حیزبێکم لەوانە خۆشتر دەوێ، لەلای یەکێتییەکان خۆم بەلایەنگری ئەوان داناوە، لای پارتییەکانیش خۆم بەپارتی داناوە. بەم شێوەیەش لەلای هەموویان ئیشم باش دەڕوات و ڕاناوەستێ.

خەمەش گوتی: ئەوەی نەتناسێت پێت دەڵێن گێل، کەچی لەهەمویان ئاقڵتری، بۆ بەرژەوەندی خۆت یاری بەهەمووان دەکەیت سەنگەریش دەگۆڕیت وەک بەلاتەوە ئاسایی بێت، ئەدی تۆ پارتی نەبووی و لەڕێکخراو نەبوویت! دوایش بۆ بەرژەوەندی چوویتە مەڵبەندو بوویتە ئەندامێکی یەکێتی و دوایش کەهیچییان لێ هەڵنەوەرا جارێکی تر بوویتەوە بەپارتی، بەڵام ئەمجارە لەسەرۆکی ڕێکخراوی حەیرانبێژانیش نەمایت، فتیان کردی.

## شیرین هەر شیرینە!

شـێخانی هەرچەنـدە هاوسـەرگیری کردبـوو، چەنـد کـچو کوڕێکیشی هەبوو، بەڵام لەوەتی وەلید جووتیارو حامد زامدار چیرۆکی شیرینو فەرهادییان بۆی گێڕابۆوە، عیشقی شـیرین لەکەڵـلەی دابـوو. ئەو لەبەر شـیرینەکەی فەرهـاد، هەمـوو شیرینێکی خۆشدەویست.

ڕۆژێـک لەگەڵ بـرایم خۆشـناو لەژووری پـارێزەران دانیشتبووین، شێخانی هـاتە لامـانو داوای لـێ کـردین شـیرینی پارێزەری بۆ ڕازی بکەین هاوسەرگیری لەگەڵ بکات .

شـیرین کچێکی بەرچـاو بـوو، لەگەڵ ئـێمە لەکۆلێژی یاسـا خوێنـدبووی، نـاوی خـۆی بەخـۆیەوە بـوو، شـۆخو شـەنگو خـوێن شـیرین بـوو، چاوەکـانی دەتگـوت چـاوی مـامزن، برۆکانیشـی پـڕو درێـژ بـوون، جەسـتەیەکی نەرمو نـۆڵو ڕۆمانسـی هەبـوو، لەگەڵ قسـەکردن تـاڵە مووەکـانی پرچـی لەنەرمو نۆڵییـان وەک ئاوریشـم بەسـەر ڕوویـدا هـاتبوو خوارەوە.

بەر لەوەی وەڵامـی بدەمەوە، بـرایم خۆشـناو گـوتی: ئەگەر نانێکمان بۆ بکڕیت، بۆت پێی دەڵێین.

ئەویش گوتی: ئەگەر ڕازیتان کرد، بەقۆزی داوەتتان دەکەم .

برایم خۆشناویش گوتی: ئێمە حازر بەقەرز نادەین، کێ دەڵێ ئەو ڕازی دەبێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات، تەنها پێگوتن لەسەر ئێمەیە، تۆ پارەکەمان بدێ، خۆمان نیوەڕۆ دەچینە چێشتخانەی مام یوسفو لەسەر شەرەفی تۆو شیرین قۆزی دەخۆین.

شێخانیش دەستی خستەوە گیرفانیو دە دیناری دەرهێناو دایە دەستیو گوتی: ئەو پارەیەم لێ وەربگرە، چی دەخۆنو ناخۆن کەیفی خۆتانە، تەنها یەک شتم لەئێوە دەوێت، بەشیرین بڵێن دەمەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم.

ئەمەی گوتو ئێمەی بەجێ هێشتو ڕۆیشت.

دوای ماوەیەک شیرین هاتە ژووری پارێزەرانو سڵاوی لەمنو برایم خۆشناو کردو لەسووچێکی ژوورەکە دانیشت. منیش ڕووم تێ کردو بەپێکەنینەوە پێم گوت: شیرین مزگێنیم لێت دەوێ، داخوازیت هاتووە؟

شیرینیش بەتەوسەوە پێی گوتم: کەسێکی دەوڵەمەندە، یان بەرپرسێکی گەورەیە؟!

گوتم: شێخانیت لەبیر ماوە، ئەو کوڕە گەنجەی کەلەکاتی خوێندنمان لەکۆلێژ دەهاتە لام، تەنانەت جارێک بەیەکتریشم ناساندن؟

گوتی: مەبەستت ئەو کوڕەیە کەقسەو گوفتاری بەگێلان دەچوو؟

برایم خۆشناویش گوتی: گێلی چییە، ئەگەر گێل با، ژنیان نەدەدایەو ئێستاش داوای تۆی نەدەکرد؟

ئەویش گوتی: ئەوەبوو سوپرایزەکەتان، بۆچی من گێلم هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو بکەم.

منیش بەپێکەنینەوە پێم گوت: هاوسەرگیری لەگەڵ بکە، زەرەر ناکەیت، ڕاستە ئەو کەسێکی گێلۆکەیە، بەڵام زۆر دڵسافو ساویلکەیەو دەتوانی وەکو ئەنگوستیلە لەپەنجەکانت بیسوڕێنیت.

شیرینیش بەتوڕەییەوە گوتی: تۆ چیت لێم دەوێ، لەکۆلێژیش لێم نەدەگەڕایت، تەشقەڵەت پێ دەکردم، لێرەش لێم ناگەڕێیت، وادەزانی هەندە بێ ئەقڵم بەقسەت بکەمو هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو گێلە پیاوە بکەم.

ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو سەربردەیەدا ڕەت ببوو، شەوێک لەدرەنگانی شەودا، دونیا تاریکو ئەنگوستەچاو بوو، لەشیرینی خەودا بووین، دەنگی دەرگا هات، هاوسەرەکەم لەخەو ڕاچڵەکیو بەدەنگێکی بەرز گوتی: هەستە، کەسێک لەدەرگا دەدات، لەوانەیە کەسێکی نزیکی من، یان تۆ شتێکییان لێ بەسەر هاتبێت، بۆیە بەم درەنگی شەوە لەدەرگا دەدەن.

کارەبا نەبوو، لایتەکەمان دەست دایەو بەیەکەوە چووینە دەرەوە. لەتاریکیان چاو چاوی نەدەدیت، هاوسەرەکەم لەترسانو لەخەمی ئەوەی شتێک بەسەر خانەوادەکەی هاتبێت، زۆر شڵەژا بوو، دڵی بەخێرایی لێی دەدا. ئەو سەردەمە دزیش زۆر بوو، بەسەر ماڵانیاندا دەدا، دنیا ئەمین نەبوو، لەسەر عەلاگە بەدەست بوونێک زەلامیان دەکوشت، بۆیە نەوێراین دەرگا بکەینەوە تا دەنگمان دا، ئینجا شێخانی دەنگی هەڵبڕیو زانیمان ئەوە، بۆیە بڕیارماندا دەرگاکە بکەینەوە .

کەدەرگام کردەوە، شێخانیم بینی، دەستی کچێکی گرتبوو، دەتگوت عاشقو مەعشوقن، وەکو مار لەیەکتری ئاڵابوون. کەمنی بینی گوتی: خەونەکەم هاتە دی، شیرینم هێنا.

کەوای گوت، ڕووناکی لایتەکەم لەدەموچاوی کچەکەدا، ئەو شیرینە نەبوو کەداوای لەمنو برایم خۆشناو کردبوو بۆی پێک بهێنین. بەڵکو کچێکی تر بوو، چاوەکانی لەڕەشیتیان وەکو چاوی مار دەبریسکایەوە.

پێم گوت: وەرنە ژوورەوە، بۆم باسکە ئەم کچە کێیەو چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ کردوویت؟

ڕووی لەهاوسەرەکەم کردو گوتی: براژن وابزانم خەوم لێ تێکدان، داوای لێبووردنتان لێ دەکەم، ئەگەر بمزانیبا خەوتوون نەدەهاتم، ئەوەشم ڕەچاو نەکرد کەدنیا نا ئارامەو ئاسپاردە نییە .

هاوسەرەکەم زۆر ڕقی لەو پیاوانە دەبێتەوە کەژنی دووەم دەهێنن بۆیە بەتوڕەیی ڕووی تێ کردو بێ ئەوەی حاشا حازری لێ بکات، پێی گوت: عەمری ئەو ژنەش نەمێنێ کەمێرد بەپیاوێک دەکات ژنو منداڵی هەبێت.

ئەمەی گوتو بێ ئەوەی خواحافیزییان لێ بکات ڕۆیشتە ژوورەوەو بەجێی هێشتین.

شێخانیش گوتی: ئەو هاوسەرەی تۆ بۆچی وەها توڕەو توندە؟

منیش گوتم: زۆر ڕقی لەو پیاوانە دەبێتەوە کەلەژنێک زیاتریان هەیەو بەئاژەڵ دەیانشوبهێنێت .

ئەویش گوتی: چۆن دەزانێت پێشتر ژنم هێناوەو ئەمە ژنی دووەممە؟

گوتم: خۆت نازانیت زمانم پەلە، هیچ قسەیەکم لا گیر نابێت، باسی شیرینەکەی ترم بۆی کردووەو پێم گوتووە کەژنو مندالت هەیەو خولیای شیرینەکەی فەرهاد لەکەللەی داویتو دەتەوێ بەخەیاڵی ئەو شیرین بێنیت.

ئەویش گوتی: تۆش برۆ بخەوە، ئێمەش دەڕۆین.

منیش گوتم: پێت نەگوتم شیرین خانت چۆن هێنا؟

گوتی: لەغەمگین قاوەچی برادەرت بپرسە، ئەو هەموو شتێک دەزانێت.

ئەمەی گوتو خواحافیزی کردو ڕۆیشتن.

زۆرم مەراق بوو بزانم ئەو شیرینە کێیەو چۆن ڕازی بوو سەر بەهەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ شێخانی بکات.

ئەوەبوو ڕۆژی دواتر سەردانی غەمگین قاوەچیم کردو پێم گوت: دوێنێ درەنگانی شەو، شێخانی لەماڵەوە هاتە لام، قۆڵی لەقۆڵی کچێک هەڵکێشابوو، پێی ناساندمو گوتی ناوی شیرینە،

ژنە نـــوێیەکەمە. منـــیش پـــێم گـــوت: کچـــی کێـــیەو چـــۆن هاوسەرگیری لەگەڵ کردیت، گوتی: لەغەمگین قاوەچی بپرسـە ئەو هەموو شتێک دەزانێت باپێت بڵێت.

کەوام گوت، غەمگین قاوەچی بەپێکەنینەوە گوتی: بەڕاستی ئەو شێخانییە پیاوێکی سەیرو سەمەرەیە.

منیش گوتم: چۆن؟

گوتی: چەند ڕۆژێک پێش ئێستا منو سەعید عەدۆو وەستا مـۆفەق‌و مـحەمەد حەیـران بەیەکەوە لەچایخـانەی مەچکـۆ دانیشـتبووین، پێی گـوتین: خۆتـان بـزر مەکەن، سبەی ئێـوارە لەماڵی میرزا کەریمی دەعوەتین.

غەمگین قـاوەچی لەدرێژەی قسـەکانیدا گـوتی: مـاڵی میـرزا کەریمـی لێرە لەگەڕەکی تەعجیل بوو، لەتەنیشـت کەبابخـانەی سوداد، مزگەوتێک لەنزیک گەراجی عەبدولڕەزاق هەیە، لەنزیک ئەوێ دێیـتە خـوارێ بـۆ لای مۆبایـل فرۆشـەکان، لەوێ بـوو. لەنـاو خـانوییێکی کـۆنی جووەکـانی تەعجیـل بـوو، بەقـادرمە بەسەر دەکەوتین، لەو شوێنەی کەلەمانگی ڕەمەزان گەنجان تـا درەنگی شەو لێی دەمێننەوەو یاری سنی سنیانێی لێ دەکەن. ئـێمەش ڕۆژی دواتـر سـەر لەئێـوارێ لەقاوەخـانەی غەمگـین خڕبـووینەوە. مـن بەرازیلیـێکم هەبـوو، لەپـێش چایخـانەی

مەچکۆم ڕاگرتبوو، گوتم مادام ماڵیان نزیکە سەیارەی لۆ ببەین؟، گۆتی: نەوەک ئیشمان پێ بێت، با بەسەیارەی بچین.

منیش گوتم: نەتان دەزانی بۆچی دەچن؟

غەمگین قاوەچیش گوتی: ئێمە بەناوی ئەوە دەچووین کەداوەتی میرزا کەریمین.

منیش گوتم: ئەو میرزا کەریمە کێیە؟

گوتی: ئەو میرزا کەریمە برادەری هونەرمەند حەسەن زیرەک بووە، خەڵکی ئێرانە بەئەسڵ، لەکوردستانی عێراق دەژی، پیاوێکی فەقیر حاڵ بوو، بەفەقیری دەژی، بەڵام سەربەرزەو بەسەربەرزی دەژی، کتێبێکیشی لەسەر حەسەن زیرەک داناوە.

منیش گوتم: چ شتێک شێخانی بەو میرزا کەریمەوە بەستبۆوە؟

غەمگین قاوەچیش گوتی: بەو پێیەی کەشێخانی فۆلکلۆر پەروەرەو بایەخ بەفۆلکلۆرو کەلەپووری نەتەوایەتی دەدات، ببووە برادەری‌و لەگەڵی ڕێککەوتبوو کەشتی بۆ بگێڕێتەوە لەسەر حەسەن زیرەک، تا کتێبێک لەسەر ژیان‌و بەرهەمەکانی دابنێ‌و زانیارییەکان لەو وەربگرێت. جا ئێوارەکەی

کۆبـووینەوەو بەسـەیارە بەرازیلیـیەکەی مـن بەڕێ کەوتـین، لەپێش ماڵی میرزا کەریم سەیارەمان ڕاگرتو چووینە ژوورێ. خێـزانەکەی خـواردنێکی زۆری کردبـوو، بەتـایبەتی خـواردنی ئێرانـی لـێ نـابوو. نانمـان خـوارد، ویسـتمان چـای بخـۆینەوە، شـێخانی گـوتی: چـای لێـرە نـاخۆینەوە، چـایەکەی هەڵگـرن، دەچینە ماڵی مام مەولود حەیرانو لەوێ چایەکە دەخۆینەوە.

منیش گوتم: ماڵی مەولود حەیران لەکوێ بوو؟

گوتی: ماڵیان لەگەڕەکی گڵکەندی سێتاقان بوو .

غەمگین قاوەچی بەردەوام بوو لەگێڕانەوەی سەربردەکەو گـوتی: دوو سـەیارەمان پـێ بـوو، سـەیارەی مـنو وەسـتا مـۆفەقیش سـەیارەی خـۆی هێنـابوو. بەڕێکەوتـینو چـووینە گڵکەندو لەدەرگامانـدا. دەرگایـان کـردەوە، سـەعید عەدۆ گوتی: (مێـوانی ڕادەگـرن؟). ئەوانـیش پێشـوازییێکی گەرمییـان لـێ کردینو ئێمەیان هەڵکشاندە ژوورێ. چای حازر کراو چایەمان خواردەوە. جارێ من نـازانم ئەو بـابەتە چیە کەبۆی هـاتووین. تـومەز سـەعید عەدۆ دەیزانـی، بەڵام مـن نەم دەزانـی، بـۆ داخوازی شیرینی کچی برای مەولود حەیران هاتبووین. کە چا خورایەوە، سەعید عەدۆ گوتی: (مام حاجی ئێمە لۆ خزمـایەتی هـاتووین، ئەوە شـێخانیە، حەزدەکەم بیکەیـتە کـوڕی خـۆت.

کەوای گوت، سەیرم پێ هات، لەدڵی خۆمدا گوتم (دەبێ بابەتەکە چی بێت) سەعید عەدۆش گوتی: بۆ داخوازی شیرین هاتووین، بۆ شێخانی برامان. ئینجا گوتی: ئەگەر قبوڵی بکەیت دەمانەوێ بیکەیتە کوڕی خۆت. ئەویش گوتی: کیژ کیژی من بێت، کاک سەعید داوای بکاتو هاتبێتە داخوازی، کیژی من بەکراسی بەری پێشکەشی شێخانی بێت، ئێمەش فاتیحەیەکمان لێ خوێند. گوتی: سبەی مەلای لەگەڵ خۆتان بینن‌و مارەی بکەن. من ئەو کات بەشێخانیم گوت: کە دەچووینە داخوازی شیرینی، بۆچی خەبەری منت نەدا؟، ئەویش پێکەنی‌و دەستێکی بەسمێڵی خۆی داهیناو بەپێکەنینێکی سەیرەوە گوتی: خارە کێشە نییە.

## سەیران‌و حەیران

ئێوارەیەک غەفار مەخموری تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی: ماوەیەکی زۆرە لەگەڵ یەک دانەنیشتووین، بناری قەرەچوغ‌و دەشتی کەندیناوەو قەراج بەهاری خۆشە، گیا بستێک هەستاوە، ئەو دەشت‌ودەرە بەگوڵی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازاوەتەوە، دەڵێی چی سبەی بۆ سەیران بچینە ئەوێ‌و نانی نیوەڕۆ لەوێ بخۆین‌و هەندێکیش نیشان شکێنی بکەین‌و ئێوارەش بگەڕێینەوە.

منیش گوتم: بیرۆکەیەکی چاکە، پێم خۆشە غەمگین قاوەچییشمان لەگەڵ بێت.

ئەویش گوتی: منیش وەهام داناوە کەبێ لەئەو، شێخانیش لەگەڵ خۆمان ببەین‌و حەیرانمان بۆ بڵێت دانیشتنەکەمان بەحەیران خۆشتر دەبێت.

منیش گوتم: لەکەیەوە شێخانی فێری حەیران گوتن بووە؟

گوتی: لەوەتی شیرینی کچی مەولود حەیرانی هێناوەو خزمایەتی لەگەڵ پەیدا کردووە، ڕای لەدەنگی خۆیەتی‌و حەیرانان دەڵێ.

غەفار مەخموری ئەوەشی گوت كەعەبدولوەهاب تاڵەبانیش لەئوسترالیا گەڕاوەتەوەو ئەویشی داوەت كردووەو لەگەڵمان دەبێت.

لەدوای ڕاپەڕینەوە عەبدولوەهاب تاڵەبانیم نەبینیبوو، تاپێش ڕاپەڕین بەرپرسی ڕۆژنامەی هاوكاری بوو لەهەولێرو سەرۆكی كۆمەڵی هونەرو وێژەی كوردیش بوو. هەرچەندە پیاوێكی نزیك بوو لەڕژێم، بەڵام كەسێكی خراپ نەبوو، لەسەردەمی ئەودا چەندین چالاكی هونەریو ئەدەبیمان پێشكەش كرد. هەندێك لەو چالاكیانە بەئاشكراو بێ پێچو پەنا، توانجیان لەحكوومەت دەگرتو خەمو پەژارەی میللەتی كوردییان دەخستە ڕوو. بۆیە كەوای گوت، زۆرم پێ خۆش بوو.

ئەوەبوو ڕۆژی دوایی لەگەڵ غەمگین قاوەچی چووینە بارەگای حیزبەكەی. كەچووین، عەبدولوەهاب تاڵەبانیش لەوێ بوو. قاوەیەكمان خواردەوەو بەلاندگرۆزەرەكەی مەخموری بەڕێكەوتین. لەڕێگا لایدایە گەڕەكی مەنتكاوەو لەشەقامی مەلا عوزێر شێخانی هەڵگرتو ملی ڕێگای (مەخمور)ی گرتە بەرو بەرەو دەشتی قەراچو كەندیناوە بەڕێ كەوتین. لەبەر قسە خۆشەكانی شێخانی، نەمانزانی ئەو ڕێگایە چۆن تەواو بوو،

چیرۆکی سووتاندنی کتێبی (بناری قەرەچوغ)ی بۆ گێڕاینەوەو بەپێکەنینەوە دەیگوت: غەفار مەخموری لەجیاتی ئەوەی سوپاسم بکات کەلەشاری بەغدا لەچاپخانەی (الحوادث) کتێبم بۆی چاپ کردووەو چەند ڕۆژ بەدیار کتێبەکەی شەونخونیم کردووە. کارمەندەکانی چاپخانە عەرەب بوون، وشەکانیان لەیەکتری جودا نەدەکردەوە، بەدەستو پەنجەکانی خۆم بەقەڵەمی سوور یەک بەیەک وشەکانم لەیەکتری جودا دەکردەوە، کەچی کاکم دەڵێ کتێبەکە کەلکی نییە، بەرگەکەی کارتۆنی تایتەو کاغەزەکانیشی بۆرن، کاغەزی ڕۆژنامەن. ئەمەی گوتو بەپێکەنینەوە گوتی: منیش نەمکردە نامەردیو هەموو کتێبەکانم دایە هاوسەرەکەم، ئاگری تێ بەرداو دانووی پێ کولاند.

غەفار مەخموریش بەپێکەنینەوە گوتی: نەمدەزانی هەندە کەری، بەقسەکانم تورە دەبیو کتێبەکانم دەسووتێنی، دەنا تا کتێبەکانم لێ وەردەگرتیتەوە هیچم پێ نەدەگوتی.

منیش گوتم: تۆ چۆن زانیت کەکتێبەکەت بەکاغەزی بۆرو بەرگەکەشی بەکارتۆنی فول عادی چاپ کراوە؟

گوتی: کەشێخانی لەشاری بەغدا گەڕایەوە، دانەیەکی لەکتێبەکەم لەگەڵ دەستی خۆی بۆ هێنامەوەو گوتی: دوای حەفتەیەکی تر بەنەقلیات ئەوانی تریشمان بۆ دەنێرنەوە.

منیش گوتم: چاک نەبوو دانەیەکی لەکتێبەکەت بۆ هێنایتەوە، ئەدی ئەگەر وەکو بەختیار عەلی لێ کردبایەتو دەستنووسەکەشی لێ ون کردبایت، ئەوکات چیت دەکرد؟

ئەویش ڕووی لەشێخانی کردو پێی گوت: چیت لەدەستنووسی بەختیار عەلی کردووە، بۆمان باسکە؟

ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: ڕۆمانەکەی بەناوی (مەرگی تاقانەی دووەم) بوو، دەستنووسی ڕۆمانەکەم لێ وەرگرت تاکو بۆی ببەمە ڕەقابە، ئێستاش نازانم چی بەسەرهات. ئێمە شەوانە لەیانەی (ڕاگەیاندن) لەگەڵ حامد زامدارو فەیسەڵ دێهاتی دەمانخواردەوە، واڕێککەوت، مەرگی تاقانەی دووەم بەدەستم گەیشت کەبۆی ببەمە ڕەقابە، جا نازانم لەیانەی ڕاگەیاندن بزرم کرد، یان لەیانەیەکی تر، بەڵام گومانم لەوەدا نییە لەسەر مێزەکان بزرم کردبێت. ئیتر چاپ نەبوو، ئەویش هەر دەیگوت: کاکە تەنها دەستنووسەکەم بدەوە. بەو شێوەیە دەستنووسەکە ڕۆیشت. کەتۆ ئاگات لەخۆت نەماو بێ هۆش بوویت، لەگەڵ حامد زامدار هیچت لەبیر نامینێ.

کەوای گوت، غەفار مەخموری گوتی: دەبێ من نانێکیش بکەمە خێر، چاک نەبوو بەخێری خۆی دانەیەکی لەکتێبەکە بۆ هێنامەوە. ئەگەرنا دەبوو منیش وەکو بەختیار عەلی بەو خەمەوە بنالّم.

بەدەم قسەکردنەوە گەیشتینە شوێنێک، دەشتێکی کاکی بەکاکی، سەوز دەچۆوە لەگژو گیای بەهارو گوڵە حاجبلەو گوڵە نیسان، لەدووری ئەوێشەوە هەندێک لوولە بۆڕیمان بینی بۆ ئاسمان بەرز بووبوونەوە، وەکو ئاگری بابەگوڕگوڕ بەگوڕ ئاگرییان لێ دەهاتە دەرەوە. بەغەفار مەخموریم گوت: ئەم ئاگرە چییە لەم لوولە بۆڕییانەوە دێنە دەرێ؟

غەفار مەخموریش گوتی: ئەم خاکەی کەلەسەری دانیشتووین، دەریاچەیەکی نەوتی لەژێر دایەو ئەو شوێنەش کەئاگری لێ هەڵدەستێ، بیری نەوتەو برادەرانی ئێمە ڕۆژانە بەتانکەر نەوتی لێ دەگوازنەوە.

ئەمەو لەبەرزاییەکانی دەورو پشتی ئەوێ لەدوورەوە هەندێک کەسمان بەجلی ڕەش بینی، هەروەها شوانێکو هەندێک مەڕو مالآتیشمان لەنزیک ئەوانەوە بینی. غەفار مەخموری بەدەست ئیشارەتی بۆ کردنو گوتی: دەزانن ئەوانەی کەجلی ڕەشیان لەبەر دایە کێن؟

منیش گوتم: کێن؟

بەپێکەنینەوە گوتی: ئەوانە داعشن.

کەوای گوت، لەترسان موچڕکم پێدا هات، گوتم: ئەوانە تیرۆرستن، بمانبینن دەمانکوژن، تا ئێمەیان نەبینیوە، با بڕۆین.

گوتی: ئەوان پەلاماری خەڵکی ناوچەکە نادەن، بۆ کڕینی شتو مەک دێنە گوندەکانی ئەم ناوچەیە، تەنها پەلاماری سوپای عێراقو حەشدی شەعبی دەدەن.

ئەمەو ئیشارەتی بۆ شوانەکە کردو گوتی: ئەو شوانەی کەدەیبینن خەڵکی ئێرەیەو مەڕومالاتەکەی بەبەرچاوی ئەو داعشانەوە دەلەوەڕێنێت، ئەوانیش بەناویاندا تێدەپەڕن بێ ئەوەی قسەیەکیان پێ بڵێنو زیانیان پێ بگەیەنن.

منیش گوتم: ئەگەر بمزانیبا دەمانهێنیتە شوێنێکی ئاوا کەچەکداری داعشی لێ بێت، نەدەهاتم. ئەوانە وەکو مار وان، ئەمانیان نییە، زەمان چییە کەپەلامارمان نادەن؟

بەپێکەنینەوە گوتی ئەگەر ڕاستیت دەوێ، ئەوانە عەرەبنو خەڵکی گوندە عەرەب نشینەکانی ئەم ناوچەیەن، بەڕۆژ بەکرێو بەبێ دەنگی لەم دەشتەنو بەشەویش وەک درندە پەلاماری سەنگەرەکانی سوپای عێراقو حەشدی شەعبی دەدەن.

کەوای گوت شێخانی گوتی: ئەو ترسو لەرزەی ناوێ، ئێمە هـاتووین کەشو هەوایەک بگـۆڕین، مـرۆڤ یەکجـار دەمرێـت، پێویست بەم دڵەڕاوکێو ترسو لەرزە ناکات.

ئەمەی گوتو دەستی خستەوە ژێر گوێچکەیو دەستی کرد بەحەیـران گـوتنو گـوتی: حەیـران..ئەیـا..ئەیـا..ئەیـا... حەیـران لەبنـاران، لەبنـاری کۆیێ، حەیران چەنـد بـاس دەکەم لەبنـاران، لەبنـاری کـۆیێ، بەژنـی باریکت بەچ دەژمێـرم، بەکـار مـامزەکی گەردەن بەخار، چەند جوان دەلەوەڕێ لەپەرێزە جۆییێ، دەمگۆ لەگەر مەڕۆ هەرگرتنـێ، گـورینگی زاری دێـتە خـوارێ بەسـەر مـاری، ئـای..ئـای...ئـای... برۆیـێ. حەیـران، ئەیـا...ئەیـا... ئەیـا.. حەیـران گەوارەکـی دەینـا بەبـاو بـاران، چەنـدی گـاس دەکەم دەرێـم حەیـران شـۆڕی دەکـردەوە بەسـەر شـارەکەی کـۆیێ، هەبـری دەکێشـاوە بەسـەر پیـرە گـرو گۆمەتـارو ئیلنجـاغو بـایزاغەو بانیمـاران، شـۆڕابەبارانی دەگـرتەوەداری دیـدەوانو بانەمۆردو ناومـاری، ئۆ هـۆ هـوردە هـوردە دەیڕشێنێ سـەرو پەرچەمـی شـەنگە بێرییـان، لەگەر تـاقمی کیـژو هێـی ...هێی..کارانی.

ئەمەو نـــاوە نـــاوە لەگەڵ خـــواردنەوەی هەر پـــێکە شەڕابێکیشدا، غەمگین قاوەچیو غەفار مەخمووری بەدەنگی بەرز دەیانگوت: هەر بژی، ئەو دەنگەت نەڕزێ شێخانی.

ئەویش لەگەڵ هاندانەکەی غەمگین قاوەچیو مەخمووری زیاتر دەفع دەبوو، دەستی دەخستەوە ژێر گوێچکەکانیو دەیگوت: ئەیا...ئەیا..ئەیا.. حەیران لەگوندان کێندەر خۆشە، شەناغەم لەگەڕێ، زولفو پەرچەم تێکەر بوو لەگەر بایێ، دەکەن شەڕێ. ئەوەی ئەمنو تووی لێک کرد، غەمگین قاوەچی خودایە لەدینی وەرگەڕێ. ئۆی...ئۆی..وەرگەڕێ.

ئەمەو منیش بۆ هاندانی ناوە ناوە بەدەنگی بەرز دەمگوت: هەر بژی شێخانی.

ئەمەو بتلێک شەڕابی هەڵگرتو بەدەمی خۆیەوە نا، فرێکی گەورەی لێداو دەستی خستەوە ژێر گوێچکەکانیو گوتی: حەیران، ئەیا...ئەیا...ئەیا... حەیران دیاری، لەدوور دیاری، چەند شلکو ناسکو نازداری، حەیران دیاری لەدوور دیاری، چەندە شلکو ناسکو نازداری، پەرچەمی سۆرت چەندە پەرشو براو هاتینە خوارێ، لەمنی بزر کردییە هوردە ڕوخساری، کیژ دەرێ ئەگەر برادەرەکی بەقووەت بی

دەتدەمێ جۆتە شەمامەی ڕۆستەم بەگی باغەرێ، هەتا لەدنیا مابم غەفار مەخموری، ئەیا..ئەیا..ئەیا.. بەیەکجاری.

منیش بەدەنگی بەرز گوتم: هەر بژی شێخانی، ئەو دەنگەت نەڕزێ.

مەخموریش ڕووی لەشێخانی کردو پێی گوت: بەو حەیرانە خۆشانەی بەدەنگە زولاڵەکەت چڕیتەوە، قەرەبووی کتێبەکەت بۆ کردمەوەو چیتر خەفەتی لێ ناخۆمو گەردەنت ئازاد دەکەم.

شێخانیش بەپێکەنینەوە گوتی: کتێبێکی ترم بدێ، لەسەر دەستی ئەو جەماعەتەی ئەوجارە بەدڵی تۆ چاپی دەکەم .

ئەویش پێی گوت: ئەگەر کتێبیشم هەبێت جارێکی تر بەتۆی چاپ ناکەم، خۆم چاپی دەکەم.

غەمگین قاوەچیش گوتی: ئەگەر بەقسەی من دەکەیت، چیتر ناوی کتێب چاپکردن مەهێنەو بۆخۆت تەنها خەریکی حەیران گوتن بە. چاک نەبوو کاتی خۆی منیش کتێبی خۆم نەدایە تۆ، دەنا وەکو کتێبەکەی مەخموری هەمووت دەسووتاندو دانووت پێ دەکولاند. یانیشو ەکو کتێبەکانی عەزیزی مەلا ڕەشو ئەوانی دی دەتفرۆشتە کارگەی کرێمەستی.

ئەمەو بەدەم قسە کردنەوە، شێخانی شەڕابی دەخواردەوە، عەبدولوەهاب تاڵەبانیش بتڵێک ویسکی لەبەردەم بوو،

مۆبایلەکەی بەدەستەوە گرتبوو، وێنەی دیمەنە جوانەکانی کەندێناوەو چایی قەرەچوغی دەگرت.

شێخانی شەڕابێکی زۆری خواردبۆوە، بەوەندەش نەوەستا، دەستی بۆ بتڵە وێسکییەکەی عەبدولوەهاب تاڵەبانی درێژ کردو بەدەمییەو کردو تا چۆڕی نەدا لەدەمی نەکردەوە.

کەبتڵەکەی دانا، ڕووی لەغەفار مەخموری کردو پێی گوت: بۆچی لەحیزبەکەت نامکەیتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی؟

بەر لەوەی ئەو وەڵامی بداتەوە، عەبدولوەهاب تاڵەبانی بەپێکەنینەوە پێی گوت: ئەوە نیو بتڵ وێسکیت خواردەوە داوا دەکەیت بتکاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ئەگەر بتڵێکت بخواردبایەوە داوای شوێنی ئەوت دەکرد.

غەفار مەخموریش بەپێکەنینەوە گوتی: شێخانی برامە، ئەگەر داوای هەرچییەکم لێ بکات پێی دەدەم، ئەوم بەقەدەر قەراجو دەشتی کەندێناوە خۆش دەوێ.

شێخانی هێندەی خواردبۆوە، لەسەرخۆشیان فڕی بەسەر جمهورییەتەوە نەمابوو. هەندەی نەبرد ڕشایەوە، ئەوەی خواردبووی لەگەڵ ڕشانەوە هێنایەوە. مەخموریش بانگی دڵداری برای کردو پێی گوت: بەخێری خۆت ئاوێک بەدەموچاوی دابکە، تا سەرخۆشییەکەی بەر بدات.

دڵداریش دەستی شێخانی گرت‌و شانی خۆی خستە بەری‌و بردییە لای جەلیکانە ئاوەکەو هەندێک ئاوی بەدەموچاوی داکردو هێنایەوە.

بتڵێک شەڕاب بەپڕی مابوو بۆیە غەمگین قاوەچی بەتەوسەوە پێی گوت: ئەم بتڵە شەڕابەش ناخۆیتەوە؟

ئەویش دەستی خۆی بۆ بردو ویستی هەڵیبگرێت. مەخموری دەستی گرت‌و نەیهێشت بتڵەکە وەربگرێت‌و بەپێکەنینەوە پێی گوت: هیچی تر مەخۆوە، دەنا داوای شوێنەکەم دەکەیت‌و منیش بێ شوێن دەمێنمەوە .

غەفار مەخموری لەسەر ڕەژوو ماسی بۆ برژاندبووین، نانمان خواردو پێش ڕۆژ ئاوابوون گەڕاینەوە.

دوای چەند ڕۆژێک، ئێوارەیەک لەبەردەم تەلەفزیۆنی ڕەسەن دانیشتبووم، شێخانی لەگەڵ گۆرانی بێژ دڵشاد تۆفیق لەگەڵ تیپی موزیک لەبەرنامەی ڕەسەن دانیشتبوو، حەیرانی دەچڕی، دەیگوت: دەرێم حەیران حەیرانە، ئەیا...ئەیا..حەیران بوهار هاتەوە ڕۆژی سەیران‌و ڕازە، توو زەمینی خۆت بدە تامی ئاسمانێ لەمنیان گرت مراوی‌و قورینگ‌و قازان، دەبا بچینە زیارەتی حوسێنی غازی‌و ئۆمەری داپیرە داودی، لەوێ لەبۆ خۆمان بگرینەوە بەخت لەگەر

مـرازان، بەبەرگـی پێـک دەبـڕێین، سـارەکی دی حـازر دەکەیـن لانــــک لەگەر... هێــــی... هێــــی.....هێــــی.....لەگەر دەســــرازان، هۆو....هۆو...هۆو. حەیران لەبناران، لەبناری کۆیێ، چەندی گـاز دەکەم حەیران لەبناری کۆیێ، بەژنێ باریک لۆ خۆ دەشـوبهێنم بەکار مامزەکی گەردەن بەخـار، لۆخـۆی دەلەوەڕێتن لەپەرێزە جۆیێ، دەمگۆت لەگەر مەڕۆ هەرگرتنی چەند جوان گـورینگی زاری دێتە خوارێ بەسـەر ماری، ئێ...ئێی.. برۆیێ.

کەشێخانیم بەم شێوەیە دیت، سـەرم سـوڕما، لەدڵی خۆمـدا گوتم (ئەو شێخانییە کەسێکی سەیرو سەمەرەیە، ئەسپی خۆی لەهەموو مەیدانێک تاو دەدات، لەوەتی شیرینی برازای مەولـود حەیرانی هێناوە، خولیای حەیران گـوتن بووە، حەیـران تێکەڵـی خـوێنی بـووە، وام دەزانـی تەنهـا بـۆ حەزو ئـارەزووی خـۆی حەیران دەڵێ، نەمـدەزانی ئەو دەیەوێ کێبڕکێ لەگەڵ حەسـەن سیساوەو عارەب عوسمان بکات.

## سەرۆکێك بۆ حەیرانبێژان

ئێوارەیەک لامدا قاوەخانەکەی غەمگین قاوەچی، کتێبێکی بەدەستەوە بوو بەناوی (حەیرانبێژانی کوردستان) شێخانی ئامادەی کردبوو. کتێبەکەم لەغەمگین قاوەچی وەرگرتو تەماشام کرد، شێخانی خۆی پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسی بوو، تیایدا ئاماژەی بەدامەزراندنی (کۆمەڵەی حەیران بێژانی کوردستان) کردبوو. لەژێرەوەش ناوی خۆی وەک سەرۆکی کۆمەڵەکە نووسی بوو.

ئەوەی سەرنجی ڕاکیشام، بێ لەو حەیران بێژانەی کەدەیانناسین‌و گوێمان لەدەنگییان بووە، ناوی دەیان کەسی دیکەی تێدا بوو، فریان بەسەر حەیران گوتن نەبوو.

کەسێکم دەناسی بەهەزار فاتیحەو قولوەڵڵا بڕوانامەی ماستەری لەلاوکو حەیران وەرگرتبوو، هەولێری بوو، کوردی باش نەدەزانی، پیرەو خۆشناو نامەکەیان بۆی نووسیبووەوە، ناوی ئەویشی تێدا تۆمار کردبوو. ناوی چەندین کەسی دیکەشی بەڕاوێژکار تۆمار کردبوو کەهیچییان لەحەیران نەدەزانی.

لەهەمووشی سەیرو سەمەرە تر ئەوەبوو، وێنەی حەیرانبێژەکان‌و ئەو کەسانەی کەناویان لەکتێبەکەدا هاتبوو،

بەپێی ئینتیمای سیاسییان لەسەر چوارچێوەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ چاپ کرابوو. چوارچێوەی وێنەکان بەزۆری ڕەنگییان زەردو سەوز بوو، هەندێک ڕەنگی شینو مۆریشی تێدا بوو. تەنها یەک وێنە لەو وێنانە لەسەر چوارچێوەیەکی سوور چاپ کرابوو، ئەویش وێنەی حەیران بێژێکی کۆمۆنیست بوو، وا پێ دەچوو حیزبی شوعی تەنها ئەو حەیران بێژەیان هەبێت.

بەغەمگین قاوەچیم گوت: لەکەیەوە شێخانی بۆتە سەرۆکی کۆمەڵەی حەیران بێژان؟

بەپێکەنینەوە گوتی: ئەو شێخانیە سەرێکو سەد سەودای هەیە، هەر ڕۆژی شتێکی سەیرو سەمەرەی لێ ئاشکرا دەبێت. ڕۆژێک کتێبخانە دەکاتەوەو لەجیاتی فرۆشتنی کتێب، کتێبی کوردی تێدا ئیعدام دەکاتو دەیانکاتە کاغەزی پێچانەوەی کریمەستی. ڕۆژێکیش دەزگای بڵاوکردنەوەو دابەشکردنی کتێب دادەنێتو ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی لەجیاتی دابەش کردنیان، دەیانداتە ئوتوچییەکانو دەیانکاتە کەرەستەی پێچانەوەی جلوبەرگی ئوتوکراو. وا ئێستاش لەو گۆڕەی خۆی کردۆتە حەیرانبێژو کۆمەڵەیەکی بەناوی (حەیران بێژانی کوردستان) کردۆتەوەو ئەوەی حەیرانیش نازانی ناوی بەحەیران بێژ تۆمار کردووە .

منیش گوتم: لەکۆڕو کۆبوونەوەکان ناوە ناوە حەیرانی بۆ دەگوتین، بەڵام نە دەنگی خۆش بوو، نە تێکستەکانیشی تەواو بوون. تەنها چەند کۆپلەیەکی لەبەر کردبوو، وەکو بنیشتە خۆشە لەهەموو دانیشتنێکدا دەیجویەوە.

کاکە سوور قوماشفرۆشیش گوتی: شێخانی بەم کتێبەی ئاسانکارییێکی باشی بۆ دەزگا ئەمنییەکان‌و حیزبەکان کردووە.

منیش گوتم: مەبەستت لەئاسانکاری چییە؟

گوتی: لەمەودوا هیچ پێی ناوێ خۆیان ماندوو بکەن، ئەگەر سەیرێکی ئەم کتێبەبکەن، ئینتیمای سیاسی هەموو حەیران بێژەکان دەزانن.

ئەمەو مەجید ئەستێرەگەشەش دەستی بردەوە گیرفانی‌و ناسنامەیەکی دەرهێناو بەپێکەنینەوە گوتی: ئەو شێخانیە تاکو ئێستاش ناوی من‌و مەجید هەلۆ لەیەکدی جیا ناکاتەوە. وێنەی مەجید هەلۆی لەناسنامەکەی من داوەو وێنەی منیشی لەناسنامەکەی ئەو داوە.

منیش گوتم: لەوێنەکان بگەڕێ، ئەو گێلۆکەیە هەر ئەوەندەی لێ دەزانێت، تۆ مامۆستایت‌و هەلۆش موزیک ژەنە، پێم ناڵێی چی ئێوەی کردۆتە حەیرانبێژ؟!

ئەویش گوتی: داوای لێ کردین لەکۆمەڵەکەی ببینە ئەندام تاکو لەهەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبردن‌و سەرۆکدا دەنگی پێ بدەین.

غەمگین قاوەچیش پێی گوتم: بەلامەوە سەیرە کەداوای لەتۆش نەکردووە ببیتە ئەندام، لەبرادەرەکان کەس نەماوە ناوی لای خۆی تۆمار نەکردبێت‌و ناسنامەی حەیرانبێژانی بۆ دەرنەهێنابێت.

ئەمەی گوت‌و دەستی خستە ناو چەکمەجەی مێزەکەی‌و زەرفێکی گەورەی دەرهێنا، گوتی: ئەم زەرفە دەبینی، پڕی ناسنامەیە، بۆ نووسەران‌و ئەدیبان‌و هونەرمەندان‌و تەنانەت بۆ ئەو دوکاندارانەی دراوسێشم دەری هێناوەو لای من دایناوە، کەهاتنە لام دەیاندەمەوە.

لەم قسانەدا بووین، شێخانی بەدیار کەوت، جانتایەکی قایشی بەدەستەوە بوو، لەجانتای ئەو برینپێچە گەڕۆکانە دەچوو، کەلەکۆلانان دەگەڕان‌و زەکەری منداڵانیان سونەت دەکرد. هاتە دوکانەکەی غەمگین قاوەچی‌و پێی گوت: پارچە زەوییێکم بۆ کۆمەڵەی حەیرانبێژان لەشارەوانی وەرگرتووە، دەمەوێ تەلارێکی گەورە بۆ کۆمەڵەکەو گەلەرییێکیش بۆ نمایشکردن‌و فرۆشتنی کەل‌و پەلی فۆلکلۆری‌و کەلەپووری

کۆنی لەسەر دروست بکەم. کەسێکی سەرمایەدار ناناسیت ئەم پڕۆژەیەمان بۆ بکات؟

ئەویش گوتی: سەرمایەدار چ مەجبوورە سەرمایەی خۆی لەپڕۆژەیەکی وەهادا خەرج بکات. پێم نالێیت ئەو سەرمایەدارە چ سوودێک لەم پڕۆژەیە دەبینێ؟

ئەویش گوتی: لەو نەخشەیەی کەدامناوە، ڕیزێک دوکانم لەپێشەوە کردووە، ئەو کەسەی پڕۆژەکە دروست دەکات، لەبری ئەو سەرمایەیەی کەخەرجی کردووە، دەتوانێت تا بیست ساڵ سوود لەو دوکانانوەربگرێتو بۆ خۆی بەکرێیان بدات.

مەجید ئەستێرەگەشەش گوتی: شیردا لۆ داپیردا، ئەو کەسەی پارەی خۆی لەپڕۆژەیەکی ئەوها خەرج بکات، مەگەر کەر بێت، یان وەکو تۆ گێل بێت!

شێخانیش بەتوڕەییەوە گوتی: ئێوە هیچ لەبزنس نازانن، داوا لەمحەمەد جەعفەر دەکەم ئەو بیکات .

ئەمەی گوتو بەبێ ئەوەی ماڵئاواییمان لێ بکات ڕۆیشت .

## کودەتا

سالێک بەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەی حەیرانبێژان تێپەڕی بوو، ئێوارەیەک لەدوکانەکەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووم، شێخانیم بینی فایلێکی بەدەستەوە بوو، کەچاوی بەمن کەوت گوتی: زۆر چاک بوو کەتۆم بینی، دەمەوێ تەماشایەکی ئەم فایلەم بۆ بکەیت، پێم بڵێی لەڕووی یاساییەوە چیم پێ دەکرێ بۆ وەرگرتنەوەی هەقی خۆم. منیش فایلەکەم لێی وەرگرتو چاوێکم بەپەڕاوەکانیدا خشاند، سەرم لێی دەرنەچوو. فەرمانێکی سەرۆکایەتی شارەوانی تێدا بوو، تایبەت بوو بەتەرخانکردنی پارچە زەوییێک بۆ کۆمەڵەی حەیرانبێژان، هەروەها چەند نەخشەیەکیش، وا پێ دەچوو نەخشەی بارەگای کۆمەڵەکە بێت. فایلەکەم دایەوە دەستیو پێم گوت: سەرم لەم فایلە دەرناچێت، بەکورتی پێم بڵێ بزانم چیت دەوێ؟

ئەویش ڕووی لەئامادەبووان کردو گوتی: غەمگین قاوەچی دەزانێ چەند بەم کۆمەڵەیەماندوو بوومە، هەر لەدامەزراندنییەوە تاکو ئەمڕۆ. کەچی ئێستا کوڕەکەی مەولود حەیرانم لێ قیت بۆتەوەو خۆی پێ لەمن نزیکترە لەحەیرانو حەیرانبێژانو دەڵێ: من کوڕی مەولود حەیرانم پێ دەڵێن، تۆ کێی؟

غەمگین قاوەچیش بەتەوسەوە پێی گوت: تۆش زاوای ئەوانیت!

شێخانیش گوتی: تو ویژدانت بۆ خودا بڵێ، ئەو حەیرانەی کەلەداوەتەکەی غەفار مەخموری بۆم گوتن، هەروەها ئەو حەیرانانەی کەلەتەلەفزیۆنی ڕەسەن گوتومن، چۆن حەیرانێکن؟

غەمگین قاوەچیش گوتی: ئەشەدو حەیرانێکی ناوازە بوو.

کاکەسوور قوماشفرۆشیش بەتەوسەوە گوتی: غەمگین قاوەچی بەشایەت ناچێت، چونکە ڕاوێژکاری تۆیە، دەبێ کەسێکیتر ئەو شایەتییەت بۆ بدات.

ئەویش ڕووی لەمن کردو گوتی: بۆچی قسەیەک ناکەیت، ئەی تۆش لەداوەتەکەی مەخموری لەگەڵمان نەبوویت، بۆ من مەڵێ، بۆ خودا بڵێ دەنگم چۆن بوو؟

منیش بەپێکەنینەوە پێم گوت: ئەوەی ڕاستی بێت، هەر ئاخو ئۆفم گوێ لێ بوو، ئێستاش نازانم چیت دەگوت.

ئەویش گوتی: ئاخر زۆرم خواردبۆوە، دەنگم تێک چوو بوو، ئەگەر بڕوام پێ ناکەیت، سەیری یوتوپ بکە، ئەو حەیرانانە کەلەتەلەفزیۆنی ڕەسەن گوتومە، سەدان بینەری هەیە.

کاکەسـور قوماشفرۆشـیش بەپێکەنیـنەوە گـوتی: مـن ئەو بەرنـامەیەم بینیـوە، گۆرانیبێژێکـت لەگەڵ دایە، کـێ نـاڵێ ئەو هەموو بینەرانە بینەری ئەو نین؟!

ئەویش بەتوڕەییەوە گوتی: ئێوە برادەری خۆمن، کەئێوە وام پێ بڵێن، چۆن گلەیی لەو بکەم.

ئەمەی گـوتو دووبـارە فـایلەکەی دایەوە دەسـتمو گـوتی: لەگیرفـانی خـۆم پـارەیەکی زۆرم لەو پـڕۆژەیە خەرج کـردووە، ئێسـتاش سـەرۆکی نـوێی کـۆمەڵەی حەیرانبێـژان دەسـتی بەسـەردا گرتـووە، نە پـارچە زەویـیەکەم دەداتـێ، نە ئەو بـڕە پارەیەشـم دەداتەوە کەلـێم خەرج کـردووە. تـۆ کەسـێکی یاسـا ناسیت، چی بکەم تا مافی خۆمیان لێ وەربگرمەوە؟

منیش گوتم: بەر لەهەموو شـتێک ئەو پارچە زەوییە، زەوی تـۆ نیـیە، زەوی کـۆمەڵەی حەیرانبێـژانەو شـارەوانی بەنـاوی کۆمەڵەکەتـان تەرخـانی کـردووە، نەک تـۆ. سـەبارەت بەو پارەیەش کەدەڵێی بۆ دروستکردنی بارەگای کۆمەڵەکە خەرجم کـردووە، ئەمەش لێکـدانەوەی جیـا جیـا هەڵـدەگرێت، ئایـا لەبودجەی کۆمەڵە خەرجت کردووە، یان لەگیرفانی خۆت.

قسەکانی پێ بڕیم گوتی: خودا شایەتە گشت پارەکەم لەگیرفانی خۆم خەرج کردووەو فلسێکی کۆمەڵەی حەیرانبێژانی تێدا نییە.

منیش گوتم: ئەو شتە بەقسان نابێت، دەبێ بەڵگەت هەبێتو لەبەردەم دادگا بیسەلمێنیت کەئەو پارەیەی لەدروستکردنی پڕۆژەکەدا خەرجت کردووە، لەگیرفانی خۆت بووە نەک دارایی کۆمەڵەکە.

ئەویش گوتی: چۆن بیسەلمێنم، ئەوان بەچی موسڵمانن، بەقورئان سوێندییان بۆ دەخۆم کەئەو ئیشو کارانەم بەپارەی گیرفانی خۆم کردووە.

ئەمەی گوتو فایلەکەی لەدەستم وەرگرتەوەو گوتی: تۆ پێت وایە نەخشەکانی ناو ئەم فایلە بەخۆڕایی دروست کراون؟ لەو ئەندازیارە بپرسن کەبۆی دروست کردووم، بزانن چەندی لێ وەرگرتووم.

کەلەمن بێ ئومێد بوو، کەزانی هیچم بۆی پێ ناکرێت، ڕووی لەغەمگین قاوەچی کردو پێیگوت :ولاش زاواکەت وەزیری شارەوانییە، بەو بڵێ با شتێکم بۆ بکات.

ئەویش گوتی: لەم ڕۆژانە لەپارکی شانەدەر ڕێوڕەسمێک بۆ ناساندن‌و دابەشکردنی کتێبەکانی ساز دەکرێت، لەگەڵم وەرەو پێی بڵێ شتێکم بۆ بکات.

منیش داوەتی ڕێوڕەسمی دابەش کردنی کتێبەکانی بووم، کەچووم، شێخانیم بینی لەدەوری بریکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری دەسوڕایەوەو نەخشەو پەڕاوەکانی پڕۆژەکەی پیشان دەداو داوای لێ دەکرد کەلەبری ئەو پارەیەی کەبۆ پڕۆژەکە خەرجی کردووە، ئەو پارچە زەوییەی پێ بدەن. بریکاری وەزریش پێی گوت: ئەوە لەدەسەڵاتی مندا نییە، ئەوە کاری شارەوانییەو هیچ پەیوەندییێکی بەوەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە نییە. ئەویش قسەکانی خۆی دووبارەو سێ بارە دەکردەوەو پێشی لەبریکاری‌و زیر گرتبوو، لێنەدەگەڕا دابنیشێت.

کەزانی بریکاری وەزیر هیچی بۆ ناکات، ئەوجارە گوتی: مادام خۆت هیچم بۆ ناکەیت، بەوزیری شارەوانی بڵێ ئەو کارەم بۆ بکات.

بریکاری وەزیری ڕۆشنبیریش ئیشارەتی بۆ غەمگین قاوەچی کردو گوتی: ئەو پیاوە خزمی وەزیرە، برادەری خۆتە، بەو بڵێ با پێی بڵێ.

شێخانیش گوتی: پێم گوتووە، هیچم بۆ ناکات، دەڵێ خۆت پێی بڵێ.

بریکـاری وەزیـر لەڕەفتـاری شـێخانی زۆر تـوڕە بـوو، لەتوڕەییـان ئـاگر لەکـونە لـووتی دەهـاتە دەرێ، بەهەردوو دەستی شێخانی لەپێش خۆی لاداو بەدەنگێکی بەرز گوتی: بێ قەزابی دەڵێی لەهیچ تێ ناگەیت، دەمێکە قسەت بۆ دەکەمو پێت دەڵـێم ئەوە ئیشـی مـن نیـیە، کەچـی تـۆو ازم لـێ ناهێنیـتو لێناگەڕێی لەشوێنی خۆم دانیشم.

ئەمەی گوتو شێخانی بەجێ هێشـتو چووە لای وەزیری شارەوانیو لەسەر کورسییەکەی دانیشت.

کەبریکاری وەزیری ڕۆشنبیری ڕۆیشت، شێخانی جارێکی تـر داوای لەغەمگـین قـاوەچیکرد کەبەوزیـری شـارەوانی بناسێنێتو واسیدەی بۆ بکات تا ئیشو کارەکانی بۆ بکات. غەمگین قاوەچی ڕەشیدیش گوتی: من بۆ کارە تایبەتییەکانی خۆم تەکلیفم لێی نەکردووە، چۆن بۆ تۆ داوای شتێکی وەهای لێ بکەم، لەکاتێکا داواکارییەکەشت ڕێی تێ نەچێت.

ئەویـش گـوتی: ئەدی ئەو پـارەیەی لەو پـڕۆژەیە خەرجـم کردووە وا بەئاسانی دەستبەرداری ببم؟

ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: گێلەکاتی خۆشی پێنسەد دۆلاری ئەمریکیت لەمن وەرگرتو کتێبێکت بۆ تاهیر کرمانج پێی چاپ کردو تاکو ئێستاش ئەو پارەیەت نەداومەتەوە.

ئەویش گوتی: ئەگەر بەوەزیری شارەوانی بڵێی ئەو کارەم بۆ بکاتو زەوییەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەوکات قەرزەکەی تۆ دەدەمەوە.

غەمگین قاوەچیش گوتی: من دەستم لەقەرزی خۆم شوشتۆتەوە، تەنها یەک ئامۆژگاریت دەکەم، لەمەودوا کەمێک ئەقڵت بەکار بهێنەو چیتر بەدوای کڵاوی بابردوو مەکەوە.

کەلەغەمگین قاوەچیش بێ ئومێد بوو، ئێمەی بەجێ هێشتو بەتەنیا ڕۆیشتە لای وەزیری شارەوانیو گشت نەخشەو پەڕاوەکانی خستە بەر دەمیو داواکارییەکەی لێ کرد. وەزیری ڕۆشنبیریش بەبێ ئەوەی تەماشای پەڕاوەکان بکات، گوتی: ئێمە بۆ ڕێوڕەسمی ناساندنو دابەشکردنی کتێبەکانم لێرە کۆبووینەتەوە، ئەگەر هەر شتێکت هەبێت کەپەیوەندی بەمنەوە هەبێت، دەتوانی لەوەزارەت سەردانم بکەیت.

# حەملەدار

لەقاوەخانەکەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووین، شێخانی هاتە ئەوێ، دوای سڵاوکردن، دەستی خستە گیرفانیو هەندێک کارتی بچووکی دەرهێناو یەکی کارتێکی پێ داینو گوتی: نووسینگەی گەشتی عومرەی گەشتیاریم کردۆتەوە، دەتوانن بەپارەیەکی کەم لەگەڵ ئێمە گەشت بکەن بۆ شوێنە گەشتیارییەکانی وڵاتی سوریاو لوبنانو لەوێشەوە بەفڕۆکە دەتانبەین بۆ شاری جدە لەوڵاتی سعودیەو عومرە بهێننەوە.

منیش گوتم: ژیانت پڕە لەسەیرو سەمەرە، عومرەکردن بابەتێکە پەیوەندیی بەپاککردنەوەی گیانی کەسەکانەوە هەیەو وەکو ئەرکی حەجکردنە بۆ ماڵی خودا، نازانم گەشتکردن بۆ سوریاو لوبنان چ پەیوەندییێکی بەعومرەوە هەیە؟

بەپێکەنینەوە گوتی: پەیوەندیی زۆرە، دەتوانن لەسوریاو لوبنان بۆ خۆتان ڕابوێرنو بێ دڵی خۆتان نەکەن، دوایش کەگەیشتنە ماڵی خودا، تۆبە بکەنو عومرە بهێننەوەو خۆتان لەگشت گوناهەکان پاک بکەنەوە.

منیش گوتم: بۆچی فلیمی هیندییە؟!

ئەویش گوتی: ئەوە قسەی من نییە، شەرع وا دەڵێ.

گوتم: لەکوێی شەرع شتی وا هەیە؟

گـــوتی: مەلای گەڕەکەکەمـــان لەوتـــاری هەینیـــدا گـــوتی: (پێغەمـبەری خـودا فەرمـوویەتی ألعمـرة إلـي العمـرة كفـارة لمـا بينهما).

ئەمەی گـوتو دەســـتێکی بەســـمێڵی داهێنـــاو بەپێکەنیـــنەوە گوتی: خارە ئێمەش هەندێکی لێ دەزانین.

منـیش گـوتم: وەکـو تـووتی لەبەرت کـردووە، بـڕوا نـاکەم بزانیت مانای چییە.

گوتی: دەڵێ عومرە بۆ عومرە کەفارەتە بۆ هەمـوو گوناهێک کەلەو نێوەندەدا کردبێتت .

غەمگین قاوەچیش گوتی: لەو قسانە بگەڕێ، تۆ تـاکو ئێسـتا پێنج سەد دۆلارەکەی منت نەداوەتەوە، پێم نـاڵێی ئەو پـارەیەت لەکوێ بوو تا نووسینگەی عومرەو گەشتیاری پێ بکەیتەوە؟

بەپێکەنینەوە گـوتی: خـارە پەلەی چیتە، هەنـدێک پـارەم بێتە دەست دەتدەمەوە.

کاکەسوور قوماشفرۆشیش ڕووی لەغەمگین قاوەچی کـردو پێی گـوت: مـن بـم لەجیاتی تۆ، لەجیاتی ئەو پارەیە گەشـتێکی لەگەڵ دەکەم.

ئـێمە لەم قســـانەدا بـــووین، مەجیـد ئەستێرەگەشـــە بەژوور کەوت، کەچاوی بەشێخانی کەوت، پێی گوت: تۆ شـەرم لەخـۆت

ناکەیتەوە، ئەو درۆ گەورەیەت لەگەڵ کردم، بەهارت بۆ هێنامە سەر چۆکانو بەدرۆو دەلەسان منت ڕەوانەی وڵاتی چین کرد؟

نە بای پێدا هات، نە باران، بەپێکەنینەوە گوتی: چیت دەوێ، ئەوها نەبا چینت نەدەبینی.

ئەویش گوتی: بەقسە گەورەکانی تۆ هەڵخەڵەتامو چووم، ئەگەر براکانم پارەیان بۆ نەناردبام، پەکم دەکەوت .

منیش گوتم: بۆمان باس ناکەی بزانین ئەو قورمساغە چ پەندێکی پێ کردوویت؟

ئەویش گوتی: بەقسەی غەمگین قاوەچی برام نەکرد، پێی گوتم نەکەی بەقسەکانی ئەو دەجالە هەڵخەڵەتێیتو بچیتە چین، بەقسەم نەکرد، نەمزانی کەسێکی بێ بەڵێنە، بەڵێنی پێ دامو گوتی تۆ بڕۆ کەگەیشتییە ئەوێ سێ دەفتەر دۆلارت بۆ دەنێرم جلوبەرگی پێ بکڕە قازانجمان بەنیوەیی.

منیش گوتم: مادام پارەکەی نەدایتێ نەچووبایت.

گوتی: داوای ڤیزە بکە، تاڤیزەت بۆ دێتەوە، ئەو پارەیەت بۆ دەهێنم. پارەیەکی زۆرم لەڤیزەو تکتی فڕۆکە دابوو، بۆیە دەستم لێی بەر نەبوو.

منیش گوتم: تۆ مامۆستایت، چیت لەبازرگانی داوە.

گـوتی: منـداڵەکانم گەورە بـوونەو خەرجییـان زۆر بـووە، مـووچەی مامۆسـتایەتی بەشـم ناکات، بۆیە لەبـازاڕی شـێخەڵا دوکــانێکم بەکــرێ گرتــووەو جــلوبەرگی ژنــانو منــداڵان دەفرۆشم.

منـیش گـوتم: کەچـوویتە چـین بەو بـێ پـارەیە لەوێ چیـت کرد؟

گوتی: داوام لەبراکەم کرد پارەم بۆ بنێرێت. تا ئەو هەندێک پارەی لەکەسو کارو دۆستو برادەران پەیداکردو بۆی ناردم، خەرجییێکی زۆرم کەوتە سەر، لەبەر ئەوە هیچ قازانجم نەکردو بەهەزار نالی عەلی بەتکەی خۆم هەستامەوە.

شـێخانیش گـوتی: لەوە زیـاتر چیـت دەوێ، وڵاتـی چینـت بینیو پارەکەشت هاتەوە دەست.

ئەویـش بەتـوڕەییەوە گـوتی: لەڕقـی تـۆ دوکـانەکەم دایەوە خاوەنیو تاهەتایە کاسبیشم لەپێش چاو کەوت.

منیش گوتم: واز لەو قسانە بێنن، با بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمـان، بـزانین چـۆن ڕابـواردنو زیـارەتی مـاڵی خـودا بەیەک دەگەن!

غەمگـــــین قـــــاوەچیش ڕووی لەشـــــێخانی کـــــردو بەسەرسوڕمانەوە پێی گوت: ئەوە بەڕاستیتە، گەشتی عومرەو سوریاو لوبنان بەخەڵک دەکەیت؟

ئەویش ناوی چەند کەسێکی هێنا گوایە گەشتییان لەگەڵ کردووەو گوتی: ئەگەر بڕوام پێ ناکەیت تەلەفۆن بۆ ئەو برادەرانە بکە، بزانە سەبارەت بەگەشتکردنییان لەگەڵ من چی دەڵێن.

منیش ڕووم لەمەجید ئەستێرەگەشە کردو بەتەوسەوە پێم گوت: لەجیاتی ئەو شیشەی کەلێی داویت، گەشتێکی لەگەڵ بکە، لەسوریاو لوبنان یانەی شەوانی خۆشی لێیە، کەش‌و هەوایەک بگۆڕەو دواییش برۆ سعودیەو تۆبەیەکی موستەحەق بکەو عومرەکە بهێنەوە.

ئەویش گوتی: ئەو شێخانییە شتی وا قۆڕ دەکات، شەیتان بەشەیتانێتی خۆی بیری لێ ناکاتەوە.

ئەمەی گوت‌و بەشێخانی گوت: پێم ناڵێی چ شتێک گەشتێکی تەرفیهی لەگەڵ گەشتێکی ئایینی دەبەستێتەوە؟

ئەویش گوتی: گوێتان لێ نەبووە زانایانی ئایینی گوتویانە: کاتژمێرێک بۆ دڵت‌و کاتژمێرێک بۆ پەروەدگارت.

# خۆشەویستی ئافرەتێکی بەندبێژ

شێخانی هەرچەندە لەحەیران گوتندا دەنگی خۆش نەبوو، هەروەها لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیشدا، زۆر هەڵەی دەکردو زوو زوو خۆی لەبیر دەکرد، تەنانەت خۆشی لەبیر کردبوو لموزی بەرز بوو بووو خۆی لێ دەشاردنەوەو ئیشی بۆ نەدەکردنو بەسەری پەنجەی سلاوی لەحەیرانبێژان دەکرد. لەحەیرانیشدا نەزان بوو. تەنانەت لەچەند کۆپلەیەک بەو لاوە شتێکی ئەو تۆی نەدەزانی، بۆیە حەیرانبێژانو بەندێژان بەنهێنی لەدژیدا کارییان کردو لەرێگەی بەرپرسێکی حیزبی هەولیاندا لەپۆستەکەی لای بدەن. کەشێخانیش بەمەی زانی، ناچار بوو بیر لەرێگا چارەیەک بکاتەوە، تا کۆمەڵەکەو پۆستی سەرۆکایەتی کۆمەڵەکەو ئەو شتانەش لەدەست نەدات، کەخەونی پێوە دەبینی، بەتایبەتی خەونی دروستکردنی تەلاری کۆمەڵەکەو ریزە دوکانێکو ریستورانتێکی کەلەپووریش بۆ حەیرانبێژان، بەلام لەگەڵ ئەمەش دەرهەقی سەرۆکی نوێی حەیرانبێژان نەدەهات، چونکە لەحیزب لەشێخانی لەپێشتر بوو.

ئەوەبوو ئافرەتێکی بەندبێژی ئێرانی لەبۆکانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە بەسەردان هاتبووە هەرێمی کوردستانو سەردانی کۆمەڵەی حەیرانبێژانی دەکرد، بەندبێژەکە ئافرەتێکی

جوانو تەڕلووس بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو، شێخانیش ئەمەی بەهەل زانیو خۆی گەیاندە ئافرەتە بەندبێژەکەو بێ ئەوەی هیچی لەبارەیەوە بزانێت کەوتە داوی خۆشەویستییەوە.

شێخانی لەبارەی ئەو پەیوەندییەوە پێی گوتم: ئەگەر بێتو ئەو بەندێژە هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات، دەیکەمە سەرۆکی کۆمەڵەی حەیرانبێژانو لەکۆڵ پرتەو بۆڵەی حەیران بێژان دەبمەوەو چیتر ناتوانن بیانووم پێ بگرنو بڵێن تۆ حەیرانبێژ نیتو هیچ لەحەیران نازانیت.

ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێک لەئۆفیسی نیشتەجێبوونی بێگانەکان کەفالەتی کردو ڕەزامەندی دەزگا ئەمنییەکانی بۆ نیشتەجێبوونی لەشاری هەولێر بۆو ەرگرت .

شێخانی هەر بەوەندە نەوەستا، لەبودجەی خۆی خانووێکی کۆنی لەگەڕەکی عارەبان بۆ گرتو مانگانەش بۆ خەرجیو بژێوی ژیانی بڕێک پارەی پێ دەدا، تەنانەت لەو مارکێتەی کەکوڕەکەی هەیبوو کارتێکی بۆ کردبووو بەکاشێرەکانیشی گوتبوو ئەگەر ئەو ئافرەتە بەندبێژە چی ویست دەتوانێ لەمارکێتەکە بێ بەرامبەر بیبات .

ئێوارەیەک سەردانی کۆمەڵەی حەیران بێژانم کرد، شێخانیم لەگەڵ ئافرەتە بەندبێژەکە بینی، کوڕێکی گەنجیان لەگەڵ بوو، بەشێخانیم گوت: ئەو کوڕە گەنجە کێیە؟

گوتی: برابچووکی ئەو بەندبێژەیە.

لەوە نەدەچوو برای ئەو بێت. ڕەنگی پێستی لەو نەدەکرد، هەروەها ئاکارو بەژنی لەگەڵ ئەو زۆر جیاواز بوو. شێوەیان لەیەکتری زۆر دوور بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم (لەوانەیە دایکو باوکییان یەک نەبێت، زڕ برای بێت).

سەرم خستە ژێر گوێی شێخانیو پێم گوت: تۆ دڵنیایت کەبرای ئەوە؟!

بەپێکەنینەوە گوتی: دایەرەی نفوس نیم، تا دەفتەری نفوسی بۆ دەربهێنم، بەچی بزانم برای ئەوە، یان نا؟

منیش گوتم: وریابە کڵاوت لەسەر نەنێن.

کەوام پێگوت، دەمێک داماو گوتی: دەمانچەیەکم بەبیستو حەوت گەڵای ئەمریکی بۆی کڕیوە.

گوتم: بەچ بۆنەیەک لەگیرفانی خۆت ئەو دەمانچەیەت بۆی کڕیوە؟

گوتی: خوشکە بەندێژەکەی پێی گوتم: پێش ئەوەی بێیتە خوازبێنیم، دەمانچەیەک بۆ براکەم بکڕە، تا لەلای دایکو باوکم پشتگیریمان بکاتو کاری بەیەک گەیشتنمان ئاسان بکات .

منیش بەقسەم کردو ئەو دەمانچەیەم بۆی کڕی.

کەوای گوت، بەزەییم بەئەقڵی هاتەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەم گێلۆیە کەسێکی زۆر بەدبەختە، هەرچی هەیە لەسەر ورگی ئەو دەلەوەڕێت، یەکێک بەناوی گێڕانەوەی هەقایەتی شیرینو فەرهادو یەکێکیتر بەناوی گێڕانەوەی چیرۆکی خۆشەویستی مەحبووبەی نالیو ئەمەش بەناوی خۆشەویستیو پەیوەندیی سۆزدارییەوە ئەم بەستەزمانەی فریو داوەو دەیرووتێنێتەوە).

من لەو بیرکردنەوەیەدا بووم، سەری خستە بناگوێمو گوتی: خۆت ئامادە بکە، لەم ڕۆژانە بەیەکەوە دەچینە بۆکانو داوای دەستی دەکەین.

منیش گوتم: ئەقڵم ئەم ئافرەتە ناگرێت، من لەگەڵت نایەم، کەسێکی تر لەگەڵ خۆت ببە. ئەگەر بەقسەی منیش دەکەیت، باشتر وایە لێی دوور بکەویتەوە، نەوەک تووشی سەرئێشانت بکات.

ئەویش گوتی: ناچارم ئەوە بکەم، دەنا کۆمەڵەی حەیران بێژانو پارچە زەوییەکەم لەدەست دەچێت.

کەزانیم بێ سوودە لەگەڵی، خوا حافیزیم لێ کردو بەجێم هێشت.

دوای ماوەیەک، محمود جەعفەرم بینی، هاوڕێیەکی نزیکی ئەو بوو، گوتی: ئاگات لەشێخانی نییە؟

گوتم: چەند ڕۆژێک بەر لەئێستا ئافرەتێکی بەندبێژی ئێرانیی خەڵکی بۆکانم لەگەڵ بینی، داوای لێ کردم لەگەڵی بچمە ئێران بۆ خوازبێنی.

ئەویش گوتی: بەختت هەبوو لەگەڵی نەچوویت، زۆر لێم پاڕایەوە، ناچاربووم لەگەڵی بچم. خۆت دەزانیت دەمێکە منو شێخانی یەکدی دەناسینو دراوسێی یەکیشین، بۆیە لەگەڵی چووم، تەنانەت خەرجی ڕێگاو خواردنی خۆمو ئەویشم لەئەستۆ گرت .

ئەمەی گوتو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: چاوم لەو پارەیە نییە کەبۆم خەرج کردووە، خەفەت لەوە دەخۆم نازانم ئەو گیلۆیە کەی ئاقڵ دەبێت!

منیش گوتم: ناکات لەنیوەی ڕێگا خوازبێنییەکە پەشیمان بووبێتەوە؟!

ئەویش گوتی: خۆزگە پەشیمان دەبووەو دەگەڕاینەوە.
شەرمەزاری کردم، تۆ دەزانیت عەیبێکی چەند گەورەیە داخوازی ئافرەتێک بکەیت، مێردی هەبێت؟

منیش گوتم: مەبەستت چییە، ناکات ئەو ئافرەتە بەندێژە مێردی هەبووبێت؟!

بەتەوسەوە گوتی: خۆزگە تەنها مێردی هەبوایە، پێمان تەلاق دەداو لەشێخانیمان مارە دەکرد.

کەئەوەم گوێ لێ بوو، حەپەسام، گوتم: شتی وا چۆن دەبێت؟

گوتی: کوڕێکی گەنجی لەشاری هەولێر لەگەڵدا بوو، گوایە برایەتی، کەچی مێردی بەندبێژەکە بوو، تەنانەت کچێکی هەرزەکاریشیان هەبوو، تازە بنی مەمکانی دانابوو.

منیش بەپێکەنینەوە گوتم: تەمەرخان ترێی هێنا، ئەم گێلۆیە چی کردووە؟!

گوتی: خۆزگە لەوێ دەبوویت، بەچاوەکانی خۆت دەتبینی چۆن شێخانییان ڕەزیل کرد. ژنە بەندبێژەکەو مێردەکەی حاشایان لەهەموو شتێک کرد. شێخانیش داوای دەمانچەکەو ئەو زێڕو دیارییانەی کرد، کەپێی دابوون، ژنە بەندبێژەکەش لەبەردەم دایکو باوکی حاشای لێ کردو گوتی: ئەم پیاوە شێتە، خەونی بینیوە

## حاجی ڤسڤۆر

پاش ئەوەی مەحموود جەعفەر ڕووداوەكەی بۆكانی بۆ گێڕامەوە، بەباشم زانی سەردانی شێخانی بكەمو لەزاری خۆیەوە تەواوی ڕووداوەكە بزانم.

ئەوەبوو ئێوارەیەك چوومەماڵیان، لەدەرگامدا، كوڕە گەورەكەی دەرگای كردەوە، سڵاوم لێ كردو لەتەندروستی باوكیم پرسی، بەخەمبارییەوە گوتی: باوكم لەوەتی لەسەفەری ئێران گەڕاوەتەوە، بارودۆخی تەندروستی باش نییە. نازانین چی بەسەر هاتووە، هیچ قسەیەكمان بۆ ناكاتو تەنانەت خواردنیش وەكو جاران ناخواتو خۆی لەماڵەوە گۆشەگیر كردووەو ناچێتە دەرەوە.

منیش لەدڵی خۆمدا گوتم (دیارە ئەو ڕووداوەی مەحموود جەعفەر بۆی گێڕامەوە ڕاستە)، هیچ دەنگم نەكرد.

شێخانی كەچاوی پێم كەوت، چاوەكانی پڕی ئاو بوون، تەماشایەكی كوڕەكەی كرد، ویستی بگریەت، بەڵام لەشەرمی كوڕەكەی گریانەكەی قووت دایەوە.

كوڕەكەی ئاوو چای بۆ هێنایەو ئێمەی بەتەنیا بەجێهێشت. ڕووم لەشێخانی كردو پێم گوت: ئەوەی مەحموود جەعفەر باسی دەكات ڕاستە؟

ئەویش گوتی: خۆزگە بەقسەی تۆم بکردبا، لەو ژنە فێڵبازە نزیک نەدەبوومەوە.

منیش گوتم: ئەو ژنە یەکەم کەس نییە فێڵی لێ کردبیت، نازانم تاکەی تۆ بەدڵ سافی دەمێنیتەوەو بەهەموو کەسێک باوەڕ دەکەیت؟!

گوتی: بەس خودا بکات ئەم جارە هەندێک پارەو پوولم بێتە دەست، فلسێک بەخۆڕایی بەکەس نادەم.

کەدیتم بارودۆخی باش نییەو لەخەفەتی ئەو بەندبێژە بۆکانییە تووشی نەخۆشی دەروونی بووە، پێم گوت: بۆچی بەیەکەوە سەفەرێک بۆ تورکیا نەکەین، شوێنی خۆشی لێیە، بەیەکەوە هەوایەک دەگۆڕین، بەدیتنی ژنەڕووتەکانی ڕۆخی دەریا شەحن دەبیتەوەو ئەم ڕووداوە تاڵەش لەبیر دەکەیت.

کەوام پێ گوت، زۆری پێ خۆش بوو، وەکو ئەوەی نە بای پێدا هاتبێت نە باران، یەکسەر لەناو جێگا هەستایەوەو گوتی: هیچ پارەم نییە، ئەوەی هەم بوو لەو بەندبێژە بۆکانییەم خەرج کرد، تۆ پارەی ئەم سەفەرەم بەقەرز دەدەیتێ؟

گوتم: ئێمە برای یەکین، ناوی قەرز مەهێنە، تۆ داوەتی منی، خەرجییەکـــانی ئەم ســـەفەرەت هەمـــووی دەدەم. بەس یەک داواکاریم لێت هەیە؟

بــــێ ئەوەی بزانێـــت داواکـــارییەکەم چیـــیە، گــــوتی: داواکارییەکەت لەسەر سەرو لەسەر چاو.

منــیش بەپێکەنیــنەوە پــێم گــوت: گێلـــۆ نـــابێ بپرســـیت داواکارییەکەم چییە؟

ئەویش گوتی: دەزانم تۆو غەمگین قاوەچی بەڕاستی منتان خـۆش دەوێ، وەک ئەوانیتـر بـۆ بەرژەوەنـدی خۆتـان بەکـارم ناهێنن.

منـیش گـوتم: تـاکە داواکـاریم لێـت ئەوەیە، لەمەودوا ببیـتە پیاو، چیتر خۆت نەکەیتە گاڵتەجاڕو دەسکەلای ئەمو ئەو.

گــوتی: وانەیەکـی وەهـام وەرنەگرتـووە جـارێکیتر لەبیـری بکەم.

منیش گـوتم: ئێسـتا هەنـدێک کـارم هەیە، دەڕۆم، خـۆت کـۆ بکەوە، ئەوەی ڕوویدا لەبیری بکە. لەم ڕۆژانە ڤیزەی تورکیا وەردەگـــرینو بەیەکەوە دەچیـــنە شـــاری ئالانیـــاو ئەنتاڵیـــای گەشتیاری.

پاش ئەوەی ڤیزەی تورکیامان وەرگرت، بەفڕۆکە چووینە شاری دیار بەکرو لەوێشەوە بەپاس چووینە ئالانیا. کەگەیشتینە ئالانیا، تەکسییەکمان ڕاگرت، داوامان لێ کرد بمانبات بۆ هوتێلێک ڕووی لەدەریا بێتو زۆریش لێی دوور نەبێت.

ئەوەبوو ناوی هوتێلێکی پێ گوتین، پێنج ئەستێرە بوو، ناوی (Amore Hotel) بوو، گوتی: ئەم هوتێلە هەموو شتێکی تیایە، مەلەوانگەیەکی داخراو لەژێر زەمینو مەلەوانگەیەکی کراوەش لەناو باخچەی پێشەوە، هەروەها بارو ساڵەی دیسکۆشی تیایە .

شێخانی جەمەدانییەکی ڕەشو ڕانکو چۆغەیەکی مەرەزی لەبەر بوو، کڵاشێکی هەورامانیشی لەپێ بوو، کراسێکی سپیشی لەبەر کردبوو، سەردەستەکانی بەدەستووری کۆنی کوردەواری پێچابۆوە، تەسبیحێکی قەزوانی درێژیشی بەدەستەوە بوو، منیش فانیلەیەکی شینو پانتۆڵێکی نیللیم لەبەر بوو، چووینە هوتێلەکە. بەرپرسی هوتێلەکە ژنێکی تورکی سوورو سپی چاو شین بوو، کەچاوی بەشێخانی کەوت، نەیهێشت لێی نزیک بینەوە، هاواری کرد، بەدەنگێکی گەورە گوتی: ئێوە کێن، لەچ هەسارەیەک هاتوون؟! نەکەن زیاتر بێنە

پێش، بگەڕێنە دواوە، شوێنمان بۆ ئێوە نییە، گەشتیارەکانمان هەموو کەسی بیانین، چاویان پێتان بکەوێ، دەترسێن.

شێخانی نەیزانی ئەو ژنە بۆچی هاوار دەکاتو چی دەڵێ، پێی گوتم: ئەو دێرە قۆڕە ئەم هاتو هاوارەی لەچییە، دەڵێی زەردەواڵە چۆتە ناو دەرپێی.

چاک بوو ژنەکە کوردی نەدەزانیو تێنەگەشت شێخانی چی دەڵێ، دەنا لەسەر ئەو قسە ناشیرینانە بەگرتنی دەداین.

بەشێخانیم گوت: هەمووی لەبەر تۆیە، ئەگەر تۆ ئەو جلەکوردییە فۆلکلۆریانەت لەبەر نەکردباو ئەو کڵاوو جەمەدانییە گەورەیەشت لەسەر نەنابوایە، ئەو ژنەش هاواری بەسەر نەدەکردین.

ئەویش گوتی: ئەو ژنە چی لەجلوبەرگی من دەوێ، ئەو دەیەوێ وەکو ئەوان بەکیرو گونی ڕووت بێمە دەرێ!

منیش گوتم: ئێرە شارێکی گەشتیارییە، تا ئەو جلانەت لەبەر بێت، لەهیچ هوتێلێک ڕامان ناگرن.

ئەمەو گەڕاینە دەرەوە، لەنزیک هوتێلەکە پارکێکی بچووکی لێ بوو، پیرەژنو پیرە مێردێک لەژێر دارێک دانیشتبوون. لەدڵی خۆمدا گوتم (باشترین چارە ئەوەیە فانیلەیەکو شۆرتێکی

سێ چارەگی بۆ بکڕمو لەکۆڵ ئەو جلوبەرگە فۆلکلۆرییانەی بکەمەوە).

لەنزیک ئەو پارکە مارکێتێکی لێ بوو، شێخانیم لەپارکەکە بەجێ هێشتو چوومە مارکێتەکە. زۆر جۆری شۆرتی مەلەوانی پیاوانەی لێ بوو، هەندێکیان زۆر کورت بوون، هەندێکی تریش دەگەیشتنە سەر چۆک، هەندێکی تریشی لێ بوو، سێ چارەگ بوو، بستێک لەخوار چۆک ڕادەوەستا. شۆرتێکی سێ چارەگی زەردی فسفۆریم لەناو شۆرتەکان بینی، لەدوورەوە وەکو چرا دەتریسکایەوە. کەچاوم پێکەوت، لەدڵی خۆمدا گوتم: (ئەو شۆرتە باشە بۆی بکڕم، تا لەدوورەوە بیناسمەوە، ئەگەر وانەکەم لەناو دەریاو ئەو جەنجاڵییەدا لێم ون دەبێتو نایدۆزمەوە).

ئەوەبوو جووتە نەعلێکو شۆرتەکەم بۆی کڕیو گەڕامەوە پارکەکە. کەشێخانی چاوی پێم کەوت، گوتی: ئەگەر ئێستا نەگەڕابایتەوە، بەدواتدا دەهاتم، بێزار بووم ئەوەندەی لەبەردەم چڕو چاوی ئەم پیرە مێردو پیرەژنە دابنیشم.

منیش گوتم: ئێرە هەولێر نییە، شارەزا بیت، نەکەیت جارێکیتر بیر لەشتی وەها بکەیتەوە، تۆ زمانیان نازانیتو لێرەش هیچ شوێنێک پێ نازانیت، ون دەبیت.

گوتی: بۆچی منت بەجێ هێشت، چوویتە کوێ؟

تیشرتو شۆرتەکەم لەناو زەرفەکە دەرهێناو گوتم: ئەوانەم بۆ تۆ کڕیوە، بڕۆ پەنای دارێک لەو دارانەو جلە کوردییەکانت دابکەنەو لەجیاتیان ئەو فانیلەو شۆرتە لەبەر بکە.

ئەویش گوتی: بۆ لەبەریان بکەم، بۆ مەلەوانی دەچین؟

منیش گوتم: گێلۆ بەو بەیانی زووە مەلەوانی چی، جارێ با بچینە هوتێلو ژوورێک بگرینو پشوێک بدەین، دوای نیوەڕۆ دەچینە سەر دەریاو مەلەوانی دەکەین.

ئەویش گوتی: ئەگەر بمزانیبا شۆرتو فانیلەم بۆ دەکڕیت، پێم دەگوتی ڕەنگێکی سوورم بۆ بکڕیت، ئەم ڕەنگە فسفۆرییە لەجلی ژینگە پارێزان دەچێت، حەزم لێی نییە.

منیش گوتم: بۆیە ئەم ڕەنگە فسفۆرییەم بۆت کڕیوە، چونکە کەس شۆرتو فانیلەی وای لەبەر نییە. ئەگەر لەناو سەدان کەس بیت، لەدوورەوە دەتناسمەوەو لێم ون نابیت.

ئەوەبوو چووە پەنای دارێکو جلە کوردییەکانی داکەندو گوتی: گو بەسەرۆکی حەیرانبێژان، گو بەجلی کوردی، بەس

ئەم جارە بگەڕێمەوە هەولێر، پانتۆڵو فانیلەیەک دەکڕم، وەکو تۆ لەبەری دەکەم.

ئەمەی گوتو کڵاوو جەمەدانیو جلەکوردییەکانو کڵاشەکەی پێچایەوەو ویستی فڕێیان بداتە ناو تەنەکەی زبڵ، پێم گوت: نەکەی ئەو جلانە فڕێ بدەیت، کەگەڕاینەوە چی لەبەر دەکەیت؟

گوتی: چیتر جلی کوردی لەبەر ناکەم، بەم شۆرتو فانیلەیە دەگەڕێمەوە.

گوتم: دەتەوێ بمانکەیتە سینەماو گاڵتە جاڕی خەڵک؟

گوتی: ئەدی لەبەر ئەو جلانە نەبوو ئەو دێرە قۆڕە ژووری نەداینێ!

منیش گوتم: هەر شتێک بەشتی خۆی، ئێرە شوێنێکی گەشتیارییەو لەهەموو دنیا گەشتیاران ڕووی تێ دەکەن، ئەم شۆرتو فانیلەیە تەنها بۆ شوێنێکی وەکو ئێرە دەست دەدات، شاری هەولێر لەسەر دەریا نییە، بۆ ئەوێ دەست نادات.

بەم شێوەیە، دوای ئەوەی شۆرتو فانیلەکەی لەبەر کرد، چووینەوە هەمان هوتێل. ژنە بەرپرسەکەی پرسگەکە چاوی

پێمان کەوت، دەستی خۆی هەڵبڕی‌و بەدەنگی بەرز بەزمانی ئینگلیزی پێی گوتین :

(OK, that's it now).پاسپۆرتەکانی لێوەرگرتین‌و ژوورێکی دوو تەختی لەنهۆمی سێیەم داینی‌و بازنەیەکیشی لەدەست کردین‌و گوتی: تا لێرە بمێننەوە دوو ژەم خواردن‌و خواردنەوەتان بێ لەخواردنەوە کهولییەکان بەخۆڕاییەو بۆفیەش کراوەیە .

دوای پشوێکی کورت، هاتینە خوارەوە، جەولەیەکمان بەناو هوتێلەکەدا کردو دوایی چوینە ناو باخچەکە بۆ لای مەلەوانگەکە. مەلەوانگەکە کۆمەڵێک کورسی‌و مێزی لەدەورو پشت بوو، ئەو گەشتیارانەی کەمەلەوانیان دەکرد، پشوویان لێی دەداو خواردنەوەی گازی‌و ناگازی‌و کهولییان لێی دەخواردەوە. گەشتیارێکی زۆری ڕووسی‌و ئۆکرانی ژن‌و پیاو لەناو مەلەوانگەکە بوون، مەلەیان دەکرد. ژنەکان مایۆیەکی تەسک‌و تروسکیان لەبەردا بوو، بەتاڵە داوێک قوزو قوونییان داپۆشی بوو.

شێخانی کەچاوی پێیان کەوت، وروژاو خۆی پێ کۆنترۆل نەکرا، بێ ئەوەی پرسم پێ بکات، خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە. مەلەی نەدەزانی، ئەو شوێنەی کەخۆی تێ هەڵدایە ناوی، زۆر

قووڵ بوو، هەموو لەشی نغرۆ بوو، تەنها سەری دیار ما، زۆری نەمابوو بخنکێت‌و بەملم دا بێت.

هاوارم کرد، داوای فریاکەوتنم کرد، یەکێک لەو کەسانەی کەمەلەوانی دەکرد، سەیری کردم، منیش ئیشارەتم بۆ شێخانی کردو پێم گوت: فریای ئەو برادەرەم بکەوە، مەلەوانی نازانێت، دەخنکێت.

کەوام پێگوت، بەخێرایی خۆی گەیاندی‌و لەناو ئاوەکە دەری هێناو پێی گوت: مادام مەلەوانی نازانیت بۆچی لەم شوێنە قووڵە مەلەدەکەیت؟

شێخانی لەترسان ڕەنگی دەموچاوی وەکو پیاز سپی هەڵگەڕابوو، نەیدەزانی چی بڵێت، بەئینگلیزییەکی سەقەت کەلەقوتابخانە فێر ببوو، لەجیاتی ئەوەی پێی بڵێ سانکیو پێی گوت تانکیو!

منیش پێم گوت: جارێکیتر هەڵەی وەها نەکەیتەوە، ئەم مەلەوانگانە قووڵن بۆ ئەوکەسانە کراون کەمەلەدەزانن، بۆ ئەوانەی وەک تۆو منداڵ‌و هەرزەکاران مەلەوانگەی تریان هەیە، نابێت لەخۆتەوە خۆت فڕێ بدەیتە ناو ئاوەوە.

ئەویش گوتی: تۆبە جارێکیتر ئەم هەڵەیە ناکەم، لەخۆشی ئەو ژنە ڕووتانە خۆم فڕێ دایە ناوی، زۆری نەمابوو لەبەر خاتری ئەو قوز ڕووتانە بخنکێم.

منیش گوتم: هەندێک لێرە دادەنیشین‌و یەک دوو پێک بیرەو شەراب دەخۆینەوە، دوایی دەچینە ڕۆخی دەریا، لەوێ چی دەکەیت بیکە، ترسی ناوێ، ئاوی دەریا سوێرە نقووم نابیت، بەکەیفی خۆت مەلەوانی بکە.

بەقسەی کردم‌و لەپشت مێزێک دانیشتین‌و داوای دوو پێک‌و یسکیمان کرد. یەکەم جار بووو یسکی بخۆمەوە، لەترسی سەرخۆش بوون بەترس‌و لەرز دەمخواردەوە. بەڵام شێخانی گلاسەکەی بەسەر دەمی وەدەکردو وەکو ماستاو ویسکییەکەی فڕ دەکرد. زۆرم پێ گوت لەخواردنەوە پەلە نەکات، لەسەرخۆ ویسکییەکە بخواتەوە، بەڵام گوێی بەقسەکانم نەدا، تا من پێکێکم دەخواردەوە، ئەو چوار پێنج پێکی دەچۆڕاندەوە. ویستی داوای پێکێکی تر بکات، نەمهێشت، پێم گوت: ئێمە هاتووین هەوایەک بگۆڕین نەک سەرخۆش بین‌و ببینە گاڵتەجاڕی خەڵک.

هەندێک منگە منگی کردو گوتی: لێم گەڕێ با سەرخۆش بم .

ئەمەی گــوت‌و ڕووی لەمەیگێــڕەکە کــردو بەدەنگــی بەرز کــۆپلەیەکی لەنــاڵەی جــودایی هێمنــی موکریــانی خوێنــدەوەو گوتی: ساقییا! وا بادەوە، وا بادەوە

ڕوو لەلای من کەبەجامی بادەوە

موشتەری وەک من لەمەیخانێ کەمن

زۆربەیان شادو بەکەیفـو بێ خەمن

مەی حەرامە بۆ سەهەندەو بێ خەمان

مەستی بێ خەم بۆچی بگرن ئێخەمان

ئەم شەڕابە تاڵە دەرمانی خەمە

لێی حەرام بێ ئەو کەسەی دەردی کەمە.

گارسۆنەکە تێنەگەیشت چی دەڵێت، وایزانی وڕێنە دەکات، سەری خۆی لەقاندو هیچ دەنگی نەکرد.

شــێخانی کەبینــی گارســۆنەکە گــوێی پــێ نەدا، بەتــوڕەییی هەستا، ڕۆیشتە بارەکەو بتڵێک شەڕابی هێنا. بتڵی شـەڕابەکەی بەسەر دەمییەوە کرد، دەتگوت بیبسی کۆلا دەخـواتەوە، فڕێکی گەورەی لێـداو داینـایەوە، دەسـتی خسـتە ژێـر گوێچکەکـانی‌و گــۆرانی (ســاقیا وا بــادەوە)ی حەمە جەزای بەدەنگێکـی بەرز گوتەوە.

کەزانیم سەرخۆش بووەو دانیشتنەکەمان لێ تێک دەدات، بتڵە شەڕابەکەم لەبەردەمی لابردو پێم گوت: زۆرت خواردۆتەوە، هیچیتر مەخۆوە.

ئەمەو بانگی گارسۆنەکەم کرد، داوای پاکتاوکردنی حیسابەکەم لێ کرد.

تا من خەریکی پاکتاوکردنی حیسابەکە بووم، ئەوەندەم زانی بووە غەڵبەغەڵبو دەنگە دەنگ. کەئاوڕم دایەوە، گێلۆم بینی باوەشی بەژنێکی ڕووسی ناوقەد باریک کردبوو، بەهەردوو دەستەکانی توند ناوقەدی ژنەی گرتبوو، لەپشتەوە خۆی پێوە نابوو، دەتگوت نێرە کتکە بەبا هاتووە، بێ ئەوەی شەرم لەخۆی بکات، ژنەی قیڕە بڕ کردبوو.

وا پێدەچوو ژنەکە هەندە نەبێ لەمەلەوانگە دەرهاتبێت، پرچی هێشتا تەڕ بوو، ئاوی لێ دەچۆڕایەوە، مایۆیەکی کورتی پەمەیی لەبەر دابوو، لەگەڵ سوخمەیەکی سووری تەنک، گۆی مەمکەکانی لەناو دیار بوو.

هاوژینەکەی پیاوێکی چوار شانە بوو، کەچاوی بەژنەکەی کەوت، بەڕاکردن خۆی گەیاندیو بەهەموو هێزی دەستەکانی شێخانی ڕاکێشا، بەڵام شێخانی بەری نەداو بەردەوام بوو لەحنگان!

داوام لێ کرد بەری بدات، گوێی بەقسەکانی منیش نەدا. هەندەی نەبرد دوو پۆلیس هاتن، گێلۆیان دایە بەر شەق و پێلەقان، ویستییان کەلەپچەی لەدەست بکەن و لەگەڵ خۆیان بیبەن، تکام لەهاوژینی ژنە ڕووسییەکە کرد، کەبیبەخشێت، پێم گوت: لێی مەگرە، خەفەتی زۆرە، زۆری خواردۆتەوە، سەرخۆش بووەو ئاگای لێ نییە چ دەکات، دەنا کەسێکی خراپ نییە.

لەسەر قسەی من چووە لای پۆلیسەکان و لەناو دەستی دەرهێنان و ڕووی لەمن کردو گوتی: لەگەڵ خۆتی ببە، لێ نەگەڕێیت بێتە ناو خەڵک تاسەرخۆشییەکەی بەری دەدات. ئامۆژگاریشی بکە جارێکیتر زۆر نەخواتەوەو کاری وەها ناشیاو نەکات.

منیش شانم خستە بن هەنگڵی و لەگەڵ خۆم بردمە ژوورەکەمان و هەندێک ئاوم بەدەموچاویدا کردو لەسەر تەختەی نووستن درێژم کرد. وەکو مردوو جووڵەی نەبوو، تا دوو کاتژمێر خەوی لێکەوت، دوایی هەستایەوەو بەسەر سوڕمانەوە گوتی: ئێمە لێرە چی دەکەین، ئەدی لەدەم مەلەوانگە نەبووین؟!

منیش گوتم: دەزانی تۆ چیت کرد، زۆرم پێ گوتی هەندە مەخۆوە، با سەرخۆش نەبیت. بەقسەی منت نەکردو هەندەت خواردەوە ئابڕووی ئێمەت برد.

ئەویش گوتی: هیچم لەبیر نییە، بۆم باسکە چیم کردووە.

گوتم: پەلاماری ژنێکی ڕووسیت دا، ناوقەدیت توند گرتبوو، خۆت بەسمتی وەنابوو.

کەوام گوت، بەپێکەنینەوە گوتی: ئێستا بیرم کەوتەوە، ژنێکی زۆر جوانو چاوشینو بالآبەرز بوو، کاتێک بەرەو ڕووم هاتو چاوم پێیکەوت، حەزم چۆیەو خۆم بۆ نەگیرا، لەخۆشییان ئاوم لێهات، زۆری نەمابوو ڕەحەت بم، پیاوەکەی لەناو دەستی دەرهێنامو لێی تێکدام.

خۆم لێی تورە کردو پێم گوت: ئەگەر جارێکیتر ئەو ڕەفتارە ناشیرینە دوو بارە بکەیتەوە، لێرە بەجێت دەهێڵمو بەتەنیا دەگەڕێمەوە کوردستان .

کەوام پێیگوت، وەک عادەتی خۆی دەستێکی بەسمێڵەکانی داخشاندو باوەشی پێدا کردمو ماچی کردم، گوتی: خارە بەس تۆ لێم تورە مەبە، بەڵێنت پێ دەدەم هەموو شتێکت بەقسە دەکەمو جارێکیتر کاری وا ناکەم.

منیش گوتم: ئێستا دەچینە سەر دەریا، پڕە لەژنی ڕووسیو ئۆکرانی ڕووت، بڕۆ ناو ئاوەکەو بەکەیفی خۆت مەلەوانییان لەگەڵ بکە، ئاوی دەریا سوێرە لێی نقوم نابیت، لەتەنکاوەکان مەلەوانی بکە، لەبەر چاویشم دوور مەکەوە، با ئاگامان لەیەک بێت.

چووینە سەر دەریا، کەچاوی بەم هەموو ژنە جوانو قەشەنگە ڕووتانە کەوت، لەخۆشییان وەکو شێتی لێ هات، بێ ئەوەی پرسم پێ بکات، چووە ناو ئاوەکەو خۆی گەیاندە ژنە ڕووتەکانی ناو دەریا. منیش لەدوورەوە چاودێریم دەکرد، لەخۆشی ئەو ژنانە ئاگای لەمن نەمابوو، زۆر لێم دوور کەوتەوە، ئەگەر لەبەر ئەو شۆرتو فانیلە فسفۆرییەی لەبەری نەبایە، ون دەبووو نەم دەدۆزییەوە. بەڵام لەو زیاتر هیچ کەسێک شۆرتو فانیلەی وەهای لەبەر نەبوو.

## ئەمبەرو ئەوبەر

شـــێخانی زۆر چـــاوی لێبـــوو پۆســـتی ســـەرۆکایەتی حەیرانبێژانـــی بـــۆ بگەڕێنـــنەوە، تـــاکو ئەو پـــارچە زەویـــیە وەربگرێتەوە کەبۆ کۆمەلەکە تەرخان کرابوو. بەگوتەی خۆی بەنیـــاز بـــوو ڕیزێـــک دوکـــانو ڕیســـتورانتێکی خـــواردنی کـــوردەواری لەدیـــوی پێشـــەوەی تەلارەکە دروســـت بکـــاتو ئەنتیکەخانەیەکیش لەنهۆمی ژێرەوە دروست بکاتو کەلوپەلی فۆلکلۆری تێدا نمـایش بکـاتو بەپـارە بیانفرۆشـێتە گەشـتیارە بیانییەکـان. بەڵام پاش ئەوەی کوڕی حەیرانبێژێکی بەناوبانگ لەحیزب پێشی دەکەوێتەوەو متمانەی حەیرانبێژەکانو زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەکە بەدەست دەهێنێ، دەبێتە سـەرۆکو دەسـت بەسەر پارچە زەوییەکە دەگرێت. بەمە شـێخانی ڕیسـەکەی لـێ دەبێتەوە خوریو خەونەکەی نایەتە دی.

زۆر هەوڵیدا بەرپرسە گەورەکانی حیزبو حکوومەت ڕازی بکـــات کەبیگەڕێنـــنەوە شـــوێنەکەی خـــۆیو لەکۆنفراســـێکی شـــەکلیو لەهەڵبژاردنێکـــی ســـاختەدا، بـــیکەنەوە ســـەرۆک. هەرچەنـدە بەڕاسـپاردەی پارێزگـاری هەولێـر ڕۆژێکییـان بـۆ ئەنجامـدانی کۆنفرانسـەکەو هەڵبژاردنـی سـەرۆکو دەسـتەی کـارگێڕی کۆمەڵەکە تەرخـان کـرد، بەڵام لەدوا چـرکەدا هەمـوو

شتێک تێکچوو، کۆنفرانسەکە هەڵوەشایەوەو هەڵبژاردنەکەش ئەنجام نەدرا .

منیش بەشێخانیم گوت: بۆچی هەڵبژاردنەکە نەکرا؟

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: لەبەرئەوەی سەرۆکی نوێی حەیرانبێژان کاری خۆی کردو بەفێڵ نەیهێشت ئەم کۆنفرانسە بکرێت!

منیش گوتم: دیارە ئەو لەحیزب لەتۆ لەپێشترە، بۆیە پشتگیریی دەکەن.

گوتی: تەنها لەبەرئەوەی باوکی ئەو حەیرانبێژەو منیش تەنها خولیای حەیران گۆتنم هەیە، بۆیە دانم پێدا نانێن‌و پشتگیریم ناکەن.

بەڵام من بڕوام بەم بەهانەیە نەهات، دەمزانی کاریگەری سەرۆکی نوێیە کە لەحیزب لەپێشەو دەستی بەسەر سەرچاوەی بڕیارو کارەکەدا دەشکێ، بۆیە شێخانییان بەقەد ئەو لا گرنگ نییە.

ئیتر ئەوە بوو، پاش ئەوەی شێخانی لەوەرگرتنەوەی شوێنەکەی بێ ئومێد بوو، لەبەرپرسە حیزبی‌و حکومییەکان دوور کەوتەوە. ماوەیەک خۆی لەماڵەوە گۆشەگیر کردو نەهاتە دەرەوە .

ئێوارەیەک لەماڵەوە سەردانم کرد، دوو کەسی لەلا بوو، یەکێکییان کادیرێکی کۆنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، ئەوەی تریشم نەدەناسی. هەڵیکشاندمە ژوورەوەو میوانەکانی پێ ناساندمو ئیشارەتی بۆ یەکێک لەپیاوەکان کردو گوتی: ئەو پیاوە کادیری پێشکەوتووی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەو هاوڕێی منداڵیمە .

هەروەها گوتی: ئەو پیاوەی بەرامبەریشمان جێگری بەرپرسی مەڵبەندی شاری هەولێرە.

کەچاوم پێیانکەوت، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەو حیزبانەی ئێمە هەر کاتێک بزانن کادیری حیزبێک لەحیزبەکەی خۆی نارەحەتە، سەردانی دەکەنو هەوڵ دەدەن بۆ لای خۆیانی ڕابکێشن).

بەهەرحاڵ، کەبینیم میوانی هەیە، زۆر دانەنیشتم، چایەکم خواردەوەو ماڵئاواییم لێکردن.

شەوێ درەنگ، لەسەر جێگا ڕاکشابووم، دەمویست بخەوم، زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا، کەهەڵم گرت، شێخانی بوو، بەپێکەنینەوە گوتی: دەزانی ئەو بەرپرسانەی یەکێتی بۆچی هاتبوونە لام؟

گوتم: بۆچی هاتبوون؟

گوتی: داوایان لێ کردم سەنگەری خەباتم بگوازمەوەو لەناو یەکێتی درێژە بەخەباتی خۆم بدەم.

منیش بەتەوسەوە پێم گوت: درێژە بەکامە خەباتت بدەیت، بەخەباتی جاشێتییەکەی لای خاڵت، یان خەباتی حەیرانبێژی!

کەوام پێیگوت، تورە بوو، گوتی: تۆ لەهەموو کەس باشتر دەمناسیت، لەژیانمدا بۆ یەک ڕۆژیش چەکی جاشێتیم هەڵنەگرتووە، ئەوەی تۆ ناوت لێ ناوە جاشێتی، ئەوە لەترسی سەربازی بوو، خۆم لەلای خاڵم ناونووس کرد، بەکورتییەکەی جاشی بن دیوار بووم.

منیش گوتم: بەگاڵتە وادەڵێم، ئەگەر جاش بایت، چۆن هاوڕێیەتیم دەکردیت.

ئەویش گوتی: هیچ ئومێدم بەو حیزبەی خۆم نەماوە، لەبەر کوڕی ئەو حەیرانبێژە هیچم بۆ ناکەن، بۆیە بەداواکارییەکەیان ڕازی بووم‌و بەڵێنییان پێدام بمکەن بەئەندام مەڵبەند. بۆ من هیچ جیاوازی نییە، لێرەبم، یان لەوێ، کامیان پارەی زیاترم پێ بدات، لەگەڵی دەبم.

دوای چەند ڕۆژێک شێخانیم بینی، قەمیسە زەردەکەیی‌و تەسبیحە زەردە دنک گەورەکەی گۆڕی بوو. تەسبیحێکی سەوزی دنک گەورەی بەدەستەوە بوو، جل‌وبەرگێکی سەوزو

کڵاشێکی سەوزی لەبەر کردبوو، تەنانەت پشتێنەکەی بەریشی وەکو سەیدەکان سەوز بوو، لەنزیک بازاڕی قەیسەری ئەوم بینی، پیاوێکی لەگەڵ بوو، نەمدەناسی. سڵاوم لێ کردن، پیاوەکەی پێ ناساندم، گوتی: لەگەڵ ئەم هەڤاڵە بەیەکەوە لەمەڵبەند دەوام دەکەین .

لەدڵی خۆمدا گوتم (بەلاش نەیان گوتووە دونیا بەهەشتی گێلانە، لای شێخانی هەموو حیزبەکان وەکو یەکن، بۆ ئەو هیچ جیاوازیی نییەو بەربەی تەق تەقە، تا دوێنێ زەرد دەچۆوە دەتگوت خۆی لەزەردەچەوە وەرداوە، ئەمڕۆش سەوز دەچێتەوە دەڵێی سەیدەکانی نەوەی پێغەمبەرە).

ئەم وەزعە زۆری نەخایاند، ڕۆژێک لەقاوەخانەکەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووم، شێخانی هات، وەکو پێشان جلو بەرگێکی زەردی لەبەر بوو، تەسبیحە زەردە دنک گەورەکەشی بەدەستەوە بوو، سڵاوی کردو دانیشت.

کەبەو شێوەیە ئەوم بینی، سەرم سوڕما، پێم گوت: چۆنە جلو بەرگە سەوزەکەت لەبەر نییەو تەسبیحە سەوزە دنک گەورەکەشت بەدەستەوە نییە، ناکات گەڕابیتەوە کۆنە ئاخوڕێ!

بەپێکەنینەوە گوتی: هیچیان بۆ نەکردم، پێشینان بەلاش نەیان گوتییە بەرد لەجێگەی خۆی بەسەنگە، گەڕامەوە شوێنی خۆم .

## تێرنەخۆرە

مانگی ڕەمەزان بوو، پارێزگاری هەولێر لەکۆشکی نازە ئێوارە خوانێکی بۆ هونەرمەندانو حەیرانبێژان ئامادە کردبوو. نیو کاتژمێری مابوو بۆ بەربانگ، سەرۆکی یەکێتی هونەرمەندان ئێمەی کۆکردەوەو بەیەکەوە چووینە قەسری نازە. کەگەیشتینە ئەوێ، خاوەنی کۆشکی نازە لەبەر دەرگا چاوەڕوانی گەیشتنی پارێزگاری دەکرد. کەئێمەی دیت، بەدەست ئیشارەتی بۆ خوانەکە کرد، شێخانی بەتەنها لەپشت مێزێک دانیشتبوو، بەسەرۆکی یەکێتی هونەرمەندانی گوت: ئەم پیاوە دەناسن؟

ئەویش گوتی: بۆچی وادەڵێی؟

گوتی: ئەو پیاوە دەڵێ (حەیرانبێژمو دەعوەتی خوانی جەنابی پارێزگار کراوم)، ئەمە وایە؟

ئەویش گوتی: بەڵێ وایە. بەڵام بۆچی بەلاتەوە سەیرە؟

گوتی: پێشتر ئەوم نەبینیوەو قەتیش گوێم لەناوی نەبووە، دەزانی زیاتر چی شۆکی کردم؟

ئەویش گوتی: چی؟

گوتی: خۆتان دەزانن لەڕۆژانی ڕەمەزان پێش بەربانگ بەچەند خولەکێک خواردنو شیرینەمەنی لەسەر خوان

دادەنێین. کارمەندەکانی ڕیستوڕانت شیرینییان لەسەر گشت مێزەکان دانابوو، دوای هەندێک یەکێک لەکارمەندەکان پێیگوتم: پیاوێک دەڵێ حەیرانبێژم، لەپشت مێزێک دانیشتووە، وردە وردە وەکو بزن پاقلاوەکان دەخوات.

خاوەنی کۆشکی نازە لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی: تا گەیشتمە لای، نۆشی گیانی بێت، شیرینەمەنی گشت مێزەکانی هەللووشی بوو!

سەرۆکی یەکێتی هونەرمەندان کەئەمەی گوێ لێ بوو، سەری سوڕما، گوتی: دەنا نەخۆشی شەکرەشی هەیە. من لەخەمی شیرینییەکان نیم، خەمی ئەومە، شتێکی لێ بەسەر بێت، دەڵێن ئەوان پلانییان لەدژی داڕشتووەو بەمەبەست ئەم هەموو شیرینییەیان دەرخوارد داوە.

منیش بەپێکەنینەوە گوتم: کەواتە شیرینی بەربانگمان فت!

خاوەنی کۆشکی نازە گوتی: ئێوە خۆشبن، چ زۆر شیرینی زۆر، هەر ئەوکات شیرینیمان لەسەر مێزەکان دانایەوە. سەرۆکی یەکێتی هونەرمەندانیش ڕووی تێکردین‌و بەپێکەنینەوە گوتی: زوو کەن خۆتان بگەیەننە خوانەکە تێرنەخۆرە لێرەیە تا ئەوانیشی ئەنفال نەکردووە!

## پێشوازییێکی سەیرو سەمەرە

ئیسماعیل تەنیا شاعیرێکی گەنج بوو، دراوسێی ماڵی شێخانی بوو، ژنی دەگواستەوە، شێخانیش نانخواردنی پیاوانی بردبووە ماڵی خۆیان. کۆمەڵێک نووسەرو شاعیری بەو بۆنەیە بۆ نانی نیوەڕۆ لەماڵی خۆیان داوەت کردبوو. دکتۆر مارف خەزنەدارو عەبدولڕەحمان بێلافو محەمەد حەیرانو سەباح ڕەنجدەرو سمە سوورو و چەندین کەسی تری داوەت کردبوو .

شاعیرو نووسەرە گەنجەکان لەبەر دەرگا ڕاوەستا بوون، چاوەڕێی گەیشتنی دکتۆر مارف خەزنەداریان دەکرد. زولێخا بەندبێژو کوڕەکانیشی لەژوورەوە بوون. شێخانی بەئیسماعیل تەنیای گوت: لەدەرەوە بووەستەو چاوەڕێی گەیشتنی دکتۆر مارف خەزنەداربە، کەنزیک بۆوە، ئاگادارم بکەوە، سوپرایزێکم بۆی هەیە.

منیش چاوم گێڕا، هیچ شتی سەرنج ڕاکێشم لەژوورەوە نەبینی، لەدڵی خۆمدا گوتم (لەوانەیە بۆ ڕێزلێنانی بەرانێک لەبەردەم قاچەکانی سەر بڕێت) هەرچەندە هیچ بەرانو قەسابیشم نەبینی.

من لەو بیرکردنەوەیەدا بووم، لەسەری کۆلانەکە دکتۆر مارف خەزنەدار بەدەرکەوت، سمەسووریشی لەگەڵ بوو. ئیسماعیل تەنیا کەئەوانی بینی، چووە ژوورەوە، بەدەنگی بەرز هاواری کرد: دکتۆر مارف خەزنەدار هات.

کەشێخانی ئەوەی گوێ لێ بوو، زولێخاو کوڕەکانی بەتەپڵو زوڕنا هێنایە بەر دەرگاو دەستیان کرد بەتەپڵ کوتینو زوڕنا ژەنین. زولێخاش دەستیکرد بەبەند بێژیو بەشانو باڵی مارف خەزنەداردا هەڵیداو بەگوتنی بەندەوە پێشوازی لێ کرد.

کەدکتۆر مارف خەزنەدار ئەو وەزعەی بینی، زۆری پێ ناخۆش بوو، سەری خۆی لەقاندو گوتی: ئەو شێخانییە شتی سەیرو سەمەرە دەکات، ئەگەر بمزانیبا ئەوە دەکات، نەدەهاتم، ئێستا ئەم خەڵکە چیمان پێ دەڵێن!

عەبدولڕەحمان بێلافیش گوتی: شێخانی لێی ناگیرێت، هەموو ژیانی سەیرو سەمەرەیە.

ئەمەی گوتو دکتۆر مارفی هەڵکشاندە ژووری میوانان.

لەهەمووشی سەیر تر، ئەو خواردنانەی کەئامادەی کردبوو، خواردنی کوردەواری بوون، بریتی بوو لەدانەدۆکو دۆینەو کەشکەکو پیرخەنیو قوڕاوو گەنمو ماشو شلەساوار.

کاتێک دکتۆر مارف خەزنەدار چاوی بەو خواردنانە کەوت، ڕووی لەشێخانی کردو بەپێکەنینەوە گوتی: ئەوە شیوی بوکێیە، یان فێستیفاڵی خواردنی کوردەوارییە؟!

ئەویش گوتی: ویستم خواردنێکی ناوازە بێت، بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژانی ڕابردوو، خواردنی کۆنو نەریتی بابو باپیرانمان جێبەجێ بکەین.

قاپو قاپاغەکان لەدارو قوڕی سوورکراوە دروست کرابوون، کەوچکو کەوگیرەکانیش لەدار دروست کرابوون. دکتۆر مارف کەوگیرێکی داری دەست دایەو هەندێک دۆغاوەی کردە ناو تاسەکەی بەردەمیو گوتی: ئافەرین شێخانی، خۆزگە دکتۆرە شەکراویشت داوەتی ئەم خوانە دەکرد، ئەو پسپۆرییەکەی فۆلکلۆرەو کەیفی بەم بەزمو ڕەزمە دێت.

ئەویش گوتی: لەبیرم نەکردووە، نازانم بۆچی دواکەوتو نەهات .

لەم قسانە بوون، دکتۆرە شەکراویش بەژوور کەوت. شێخانی بەزولێخاو کوڕەکانی گوت: ئەمە دکتۆرە شەکراوە، مامۆستای فۆلکلۆرە، دەهۆڵو زوڕنای بۆ بکوتن. بەزولێخاشی گوت: تۆش هەندێک بەندی بەسەردا بڵێ.

ئەوەبوو، کوڕەکانی زولێخا دەستیان کرد بەدۆڵ کوتین‌و زوڕناژەنین، زولێخاش هەندێک بەندی بەسەردا گوت‌و بەبەند پێشوازی لێ کرد.

کەدکتۆرە شەکراو ئەم دیمەنەی بینی، سەری سوڕما، باوەشی بەشێخانیدا کردو نیوچەوانی ماچ کردو بەپێکەنینەوە پێی گوت: شێخانی ئەوە تۆ چیت کردووە، ئیسماعیل تەنیا ژن دێنێ، یان تۆ؟

ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: ئیسماعیل تەنیام خۆشدەوێ، ویستم ئاهەنگێکی ناوازەی بۆ بکەم.

دکتۆر مارف خەزنەداریش گوتی: بیستم لەسەرۆکی حەیرانبێژان لایان بردویت؟

شێخانیش گوتی: کوڕی حەیران بێژێکم لێ قیت بۆوە، پشتی هەبوو، دەستی بەسەر کۆمەڵەکە داگرت.

دکتۆرە شەکراویش گوتی: خەمی لێ مەخۆ، تۆ کەسێکی ژیریت، ئەو ڕێورەسمەی بۆ ئاهەنگی ژن گواستنەوەی ئیسماعیل تەنیا کردووتە، خۆی لەخۆیدا شتێکی ناوازەیە، دەتوانی سوود لەو بیرۆکانە وەربگریت‌و ڕێکخراوێکیتر بۆ خۆت دروست بکەیت.

دکتۆر مارفیش گوتی: دکتۆرە شەکراو ڕاست دەکات، بۆچی ئەنتیکە خانەیەک ناکەیتەوە، گەشتیارێکی زۆر ڕوو لەکوردستان دەکەن، ئەو شتە فۆلکلۆریو کاری دەستییانە بەپارەیەکی باش دەکڕن.

شێخانیش پێی گوت: بیری لێ دەکەمەوە.

## یادی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دەکاتەوە

پاش ئەوەی لەئاهەنگی ژن گواستنەوەی ئیسماعیل تەنیا ئەو هەموو نووسەرو ڕۆشنبیرو فۆلکلۆرپەروەرو حەیران بێژەی داوەت کرد، بیرۆکەیەکی نوێی لا دروست بوو، ئەویش ڕێکخستنی فێستیفاڵێکی کەلەپووریو فۆلکلۆری بۆ یادکردنەوەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لەشاری قاهیرە.

شێخانی هەرچەندە کەسێکی گێلۆکەو ساویلکەبوو، بەڵام هەندێک بیرۆکەی باشی هەبوو. خەڵکی شاری هەولێر زۆر خۆشیان دەویستو ڕێزییان لێیدەگرت. بەقسە خۆشەکانیو ڕەفتارە شیرینەکانی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشاو دەچووە ناو دڵان.

پەیوەندیی لەگەڵ خەڵک زۆر فراوان بوو، سنوورێکی دیاریکراوی نەبوو. لەسەر ئاستی بەرزیش، بەرپرسێکی زۆری دەناسی. هەرچەندە لەکۆمەڵەی حەیرانبێژان نەیتوانی ڕکابەری سەرۆکە نوێیەکە بکاتو بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، بەڵام لەلایەکی ترەوە دەیتوانی دەیان کۆمەڵەو ڕێکخراویتر بەناوی جیاجیا دروست بکاتو پشتگیری بەرپرسەکانیش بەدەست بهێنێت.

ئەوەبوو ڕێکخراوێکی نوێی بەناوی (میقداد مەدحەت بەدرخان) دروست کردو خۆی گەیاندە بەرپرسەکانی هەردوو حیزبی فەرمانڕەوا لەکوردستان‌و بیرۆکەی دروستکردنی ڕێکخراوەکەو بەرنامەی کاری خۆی بۆ ڕوون کردنەوەو بێئەوەی ئاگایان لەیەک بێت، پارەیەکی باشی لێ وەرگرتن‌و دەستی کرد بەئامادەباشی بۆ یادکردنەوەی دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان)، کەیەکەم ڕۆژنامەی کوردییە، لەشاری قاهیرە لەلایەن خانەوادەی بەدرخانییەکان میقداد بەدرخانەوە لە1898/4/22 بەزمانی کوردی دەرچوو.

لەسەروبەندی کردنەوەی ڕێکخراوە نوێیەکەی، شێخانی پەیوەندی پێوەکردم‌و گوتی: دەتەوێ ئیقامەو ڕەگەزنامەی ئەورووپیت بۆ دەرچێت؟

کەوایگوت، سەیرم پێ هات، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەم گێلۆیە بەتەمای چییە، ئیقامەو ڕەگەزنامەی ئەورووپی چ پەیوەندییێکی بەمەوە هەیە!)، پێم گوت: کێ بێت حەزنەکات وەکو بەرپرسە کوردەکان‌و منداڵەکانیان لەئەورووپا نیشتەجێ نەبێت‌و ڕەگەزنامەی ئەورووپاشی لەگیرفاندا نەبێت، کوێستان‌و گەرمیان نەکات‌و وەکو ئەوانیش لەو نێوەندەدا جرت‌وفرت نەکات!

بەپێکەنینەوە گوتی: من ئەم خەونەت بۆ دەهێنمە دی، خۆت ئامادە بکە، لەم ڕۆژانە لەگەڵ خۆم دەتبەم بۆ ئەوروپا، حەزدەکەیت لەوێ مەگەڕێوە، داوای مافی پەنابەری بکەو وەکو کوردەکانی تاراوگە مافی پەنابەرێتیت پێ دەدەن و دەبیتە هاوڵاتی ئەوروپی، ئینجا لێرەش باشتر حسابت بۆ دەکەن.

کەوای گوت، جرتێکی بچووکم بۆی کێشاو بەپێکەنینەوە پێم گوت: کەچەڵ کەچەڵ بێت، تیماری سەری خۆی دەکات. جارێ تۆ خەمێک لەخۆت بخۆ، ئەوجا ئەو بەندو بالۆرەیە بەمن بڵێ!

کەوام گوت، نووسراوێکی لەگیرفانی دەرهێنا، بۆی خوێندمەوە، تیایدا فەرمانگەی کۆمەڵەو ڕێکخراوە ناحکومییەکان ڕەزامەندییان پێی داوە بۆ کردنەوەی ڕێکخراوێک بەناوی (میقداد مەدحەت بەدرخان).

پێم گوت: ئەمەش فلیمێکی نوێیە، پێم نالێی ئەم ڕێکخراوە چ پەیوەندییێکی بەبردنە دەرەوەی ئێمە هەیە بۆ ئەوروپا؟

ئەویش گوتی: تۆ ناتەوێ بەگرێنتی بۆ ئەوروپات ببەم؟

منیش گوتم: بۆم ڕوونکەوە چۆن دەمانبەیت؟

گوتی: یادی دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەشاری فرانکفۆرد لەوڵاتی ئەڵمانیا دەکەینەوە. بۆ ئەم بابەتە قسەم لەگەڵ بەرپرسی گەورە کردووە، پشتگیریی خۆیان پیشان

داوم، ڤیزەی شنگنی ئەورووپی بۆ ئەو کەسانە وەردەگرن کەڕێکخراوەکەمان لەگەڵ خۆیان دەیانباتە ئەڵمانیا .

هەرچەند بەتەواوەتی بڕوام پێ نەبوو، کارێکی وەها قورسی پێ بکرێت، بەڵام بەدووریشم نەزانی، لەدڵی خۆمدا گوتم (ئەمڕۆ ئیش بەو گێلانە دەکرێت، هەندێک لەبەرپرسەکانی حکومەت لەڕێگای ئەو جۆرە کەسانەوە کاری نایاسایی خۆیان دەکەن).

پێم گوت: تێم بگەیەنە بڕی چەندم پارە لێوەردەگریت تا بمگەیەنیتە ئەورووپا؟

ئەویش گوتی: تەنها پەنجا گەڵای ئەمریکیت لێوەردەگرم، هەقت لەهیچ نەبێ، خۆم هەموو کارەکان دەکەم.

ئەوەی ڕاستی بێت، قسەکانی نەچووە ئەقڵم، پێم گوت: بارەگای ڕێکخراوەکەتان لەکوێیە، سەردانتان دەکەمو وەڵامیشت دەدەمەوە.

ناونیشانەکەی پێدام. ڕۆژی دواتر چوومە لای. بارەگای ڕێکخراوەکەی لەناو جەرگەی بازاڕ لەنهۆمی دووەمی باڵاخانەیەک بوو، لەدیوی پێشەوەی بارەگاکە وێنەی یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی بەگەورەیی هەڵواسی بوو. دیوارەکانی ژوورەوەشی هەموو بەوێنەی ژمارەکانی

ڕۆژنامەکە ڕازاندبۆوە. لەهەموو سوچەکانی ژوورەکەش کەلو پەلی کۆنو جاجمو تەپڵو زوڕناو کەرەستەی فۆلکلۆری دانابوو. ڕیکۆردەریکیشی لەبەردەمی خۆی دانابوو، کاسێتێکی حەیرانی لەسەر دانابوو.

سلاوم لێ کردو لەلای دانیشتم. بەر لەوەی قسە بکەم، زەرفێکی لەناو چەکمەجەکەی بەردەمی دەرهێنا، هەندێک پاسپۆرتو وێنەی ڕۆژنامەنووسانو نووسەران تێدا بوو. دایە دەستمو گوتی: ژمارەیەک ڕۆژنامەنووسو نووسەرو هونەرمەند، ناویان لای من تۆمار کردووە، لەگەڵ خۆم دەیانبەم بۆ ئەوروپا. ئەگەر پەلەنەکەیتو زوو خۆت یەکلا نەکەیتەوەو بڕیار نەدەیت، شوێنت بۆ نامێنێت، دوایی گلەییم لێمەکە.

منیش گوتم: پارەشت لێوەرگرتوون؟

دەستی خستەوە ناو چەکمەجەکەو چەند سەفتەیەک دۆلاری دەرهێناو گوتی: هەموویان پارەیان داوە، تەنها ئەوە ماوە هەفتەی داهاتوو پاسپۆرتەکانیان ببەم بۆ سەفارەتی ئەڵمانیاو ڤیزەیان بۆ وەربگرم.

بەتەوسەوە پێم گوت: وا بەئاسانی؟!

گوتی: ئاسانی چی، ئەگەر لەبەر ئەو بەرپرسە باڵایانە نەبێت کەپشکییان تێدایەو پشتگیریم دەکەن، چۆن ئەم کارە دەکرێت.

منیش بەپێکەنینەوە گوتم: ئەو بەرپرسانە کەسێکی لەتۆ گێلترییان نەدیتەوە ئەم کارەی پێ بکەن؟

گوتی: تۆ من بەگێل تێدەگەیت، دوایی بۆت دەردەکەوێت کێ گێلە!

ئێمە لەو قسانەدا بووین، مەحموود جەعفەر هاتە ژوورەوە، کۆمەڵێک جۆرکی ڕەنگاوڕەنگی بەدەستەوە بوو، لەسەر مێزەکەی داناو گوتی: چەند جۆرک لەئەنتیکە خانەکەی تەنیشت گازینۆی مەجکۆ هەبوو، هەموویم کڕی. کابرای خاوەن ئەنتیکەخانە سەری سوڕمابوو، نەیدەزانی ئەو جۆرکانەم بۆ چییە.

ئەویش گوتی: خۆ پێت نەگوت؟

گوتی: ئەوە نهێنی کارە، چۆن پێی دەڵێم.

منیش گوتم: بەمنیش ناڵێن ئەو جۆرکانەتان بۆ چییە؟

شێخانیش گوتی: تۆ جیاوازی، هاوڕێیەکی نزیکی منی، لێتی ناشارمەوە، ئەو جۆرکانە لەجیاتی جانتای دبلۆماسی بەسەر بەشداربووانی فێستیڤاڵەکە دابەشی دەکەین.

منیش گوتم: ئەی بۆ جانتای دبلۆماسییان بەسەر دابەش ناکەن؟

گوتی: دەمەوێ شتێکی وا بکەم، کەکەس نەیکردبێت. مەبەستم ئەوەیە بڵێم پەیوەندییکی بەهێز لەنێوان یەکەم ڕۆژنامەی کوردیو ئەم جۆرکە فۆلکلۆریانەدا هەیەو بۆتە کەلەپووری ئەم میللەتەو بۆ هەتایە بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

ئەقڵم قسەکانی نەگرت، لەدڵی خۆمدا گوتم (لەکۆمەڵەی حەیرانبێژان هیچی بەهیچ نەکرد، دەیەوێ لەڕێگەی ئەم ڕێکخراوە نوێیەوە قوڵی هەندێک کەس ببڕێتو زیانەکانی خۆی پێ پڕ بکاتەوە)، بۆیە بڕیارمدا بەقسەکانی هەڵنەخەڵەتێم.

پێم گوت: هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

گوتی: بیری لێ بکەوە، دەنا پەشیمان دەبیتەوە.

گوتم: من بڕیاری خۆم داوەو نامەوێ ئەو گەشتە بکەم.

گوتی: بۆچی متمانەت پێم نییە؟

گوتم: دەستت بۆ هەر شتێک بردبێت، تیایدا سەرکەوتوو نەبوویت. با بزانین ئەم جارە چی دەبێت، سەرکەوتوو دەبیت، یان نا.

بەم شێوەیە شێخانیم بەجێ هێشتو تا ماوەیەکی زۆر ئاگام لەدەنگو باسی نەما.

ئێوارەیەک لەقاوەخانەکەی غەمگین قاوەچی دانیشتبووم، دوو لەو برادەرانەی کەپارەیان دابووە شێخانی بۆ ئەو گەشتە، هاتنە ژوورەوە. منیش لێم پرسینو گوتم: لەگەڵ گەشتەکەتان چۆن بوون، بۆچی گەڕانەوە ولاتی تاریکستان، بۆچی لەو بەهەشتە خۆتان بەزەویدا نەدا؟

یەکێکیان گوتی: خۆزگە ئەو هەڵەیەمان نەدەکردو ئەو پارە زۆرەشمان لەدەستی ئەو قورمساغە نەدەکرد .

منیش گوتم: هەڵەی چیتان کردووە، بۆچی پەشیمانن؟

بەر لەوەی وەلامم بداتەوە، پیاوەکەیتر کەلەگەڵی بوو، گوتی: کەوتینە ناو تەڵەوە، دەڵێن شێخانی گێلە، ئەو گێل نییە، ئێمە گێل بووین بەقسە لووسەکانی هەڵخەڵەتاینو بەدوای کەوتین.

منیش گوتم: بەمنیشی گوت کەبەپەنجا گەلای ئەمریکی لەگەڵی بچمە ئەورووپاو لەوێ مافی پەنابەرێتیم بۆ وەربگرێت، بەلام بەقسەم نەکردو لەگەڵی نەچووم.

ئەویش گوتی: خودا تۆی خۆشویستووە، کەنەکەوتوویتە داوی ئەم فێڵبازەوە.

غەمگین قاوەچیش گوتی: ئێوە باسی چی دەکەن، چما گێلۆ بۆتە ئەو پیاوە خەڵک بباتە ئەورووپا؟

گوتی: ئێمە بەچی بزانین درۆ دەکات، بارەگایەکی گەورەی بەناوی (میقداد بەدرخان) کردبوٚوەو لەبەر چاوی ئێمە تەلەفۆنی لەگەڵ بەرپرسە گەورەکان دەکردو باسی ئەو فیستیڤاڵەی بۆ دەکردن، نەمانزانی کەلەگەڵ ئەو بەرپرسانە بۆنەتە مافیاو بەناوی میقداد بەدرخان‌و ڕۆژنامەی کوردستان بازرگانی بەخەڵک دەکەن‌و کەسانی ساویلکەی وەکو ئێمەی پێ فریو دەدەن!

منیش گوتم: بۆمان باسکەن بزانین چۆن چوونە ئەڵمانیاو لەوێ چیتان کرد.

یەکێکیان گوتی: پاش ئەوەی ڤیزەی بۆ وەرگرتین، لەفڕۆکەخانەی هەولێر ڕاستەوخۆ ئێمەی برد بۆ شاری فرانکفۆردی ئەڵمانی .

منیش گوتم: هەندێک جۆرکی خوریم لەبارەگای ڕێکخراوەکەی بینی، پێی گوتم کەئەم جۆڕکانەی لەجیاتی جانتای دبلۆماسی بۆ بەشداربووانی فێستیڤاڵەکە کڕیوە، هەر بەڕاستی ئەو جۆڕکانەی بەسەر ئامادەبوواندا دابەش کرد؟

گوتی: مەپرسە ئێمەی چۆن کردە فلیم، بەناوی ناساندنی کەلەپووری کوردی بەگەلانی ئەوروپی، شاڵ‌و شەپک‌و کڵاشی کوردی‌و کڵاوو جەمەدانیشی پێ لەبەر کردین.

ئەوروپییەکـان کەئێمەیـان بەو جـلو بەرگـانە دیـت، سـەیریان پێمان دەهات، وایاندەزانی لەهەسارەیەکی دی هاتووین.

منـیش گـوتم: بەو جلوبەرگانەشـەوە بەشـداری فێستیڤاڵەکەتان کرد؟

هەناسـەیەکی سـاردی هەڵکێشـاو گـوتی: فێسـتیڤاڵی چـی، ڤیـزەو گشـت پەڕاوەکانمـان سـاختە دەرچـوو، ئێمەیـان لەفڕۆکەخانە حیجز کردو نەیانهێشت بۆ هیچ شوێنێک بڕۆین .

منیش گوتم: شێخانیشیان حیجز کرد؟

گـوتی: ئەو سـاختەچییە پێشـتر بەرنـامەی بـۆ داڕشـتبوو، کارەکانی خۆی لەوێ جێبەجێ کردبوو، کۆمەڵێک بەڵگەنامەی سـاختەی لەگەڵ خـۆی هێنـابوو، گـوایە لەکوردسـتان هەڕەشـە لەسـەر ژیـانی هەیە، بەو بیـانووە خـۆی ڕادەسـتی پۆلیسـی فیدڕاڵی کـردو داوای مـافی نیشـتەجێ بوونو پەنـابەریی کـردو ئێمەو دەیـان هـاوڵاتی کـوردی ڕۆژئـاواش کەبەو نـاوە لەگەڵـی هـاتبوون، گـورگە خـۆرەی کـردین، دوای ئەوەی چەنـد کاتژمێرێـک لەنـاو فڕۆکەخـانە حیجزییـان کـردین، سـنووورداش کراینەوە.

## ژیاننامەی پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا

ساڵو شوێنی لەدایک بوون: 1956/7/1 هەولێر

شوێنی وەزیفە: زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر/ کۆلێژی یاسا

بڕوانامەی بەکالۆریۆس‌و ماستەرو دکتۆرای لەیاسا هەیە

ناونیشانی تێزی دکتۆرا: (چوارچێوەی یاسایی ئازادی ڕۆژنامەگەری لەکوردستانی عێراقدا).

وڵاتو زانکۆ کەبڕوانامەی پێ بەخشیوە: زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر/ کوردستان/ عێراق لەساڵی 2003/7/7.

ناونیشانی ماستەرنامەکەی: (حقوق الملكية الادبية والفنية فی القانون العراقی والمقارن/ عێراق لە1996/5/21).

وڵاتو زانکۆ کەبڕوانامەی پێ بەخشیوە: زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر/ کوردستان/ عێراق لە1996/5/21

پسپۆری گشتی: یاسای گشتی

پسپۆری ورد: یاسای نێودەوڵەتی‌و دەستووری

مێژووی دامەزراندن: بۆ یەکەمجار لە1976/6/13 دامەزراوەو لە1990 خانەنشین بووەو لە1996/4/24 لەکۆلێژی یاسا لەزانکۆی سەلاحەددین بەناونیشانی مامۆستای یاریدەدەر دامەزراوەتەوە.

**ئەو پۆستانەی وەریگرتوون:**

- سەرۆکی بەشی یاسا (بەیانیان‌و ئێواران) لە2005/5/4 تاکو 2007/5/25.
- ڕاگری کۆلێژی یاسا لە20069/2/12 تاکو 2006/7/28 .
- ڕاگری کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە2006/7/28 تاکو 2008/5/15.
- ڕاگری کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتیەکان لە2008/2/15 تا 2010/8/10 .

**ئەو کۆنگرەو خولەزانستییانەی کەبەشداری تێدا کردووە :**

- یەکەمین کۆنگرەی خوێندنی باڵای زانکۆکانی هەرێمی کوردستان ساڵی 2000 بۆ گۆڕینی پرۆگرام‌و سیستەمی خوێندن.
- دووەمین کۆنگرەی خوێندنی باڵای زانکۆکانی هەرێمی کوردستان ساڵی 2006 بۆ گۆڕینی پرۆگرام‌و سیستەمی خوێندن.
- کۆنگرەی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ لەهەرێمی کوردستان، هوتێل خانزاد تەموزی ساڵی 2007.

- کۆنگرەی ئاو (هەولێر 14-15 مایس 2001) سەنتەری برایەتی بەهەماهەنگی ڕێکخراوی فاوی جیهانی.

- یەکەمین کۆنگرەی ڕاگری کۆلێژەکانی یاسا لەزانکۆکانی عێراقی لەبارەی خوێندنیو انەی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی (اردن_عمان) ساڵی 2007.

- کۆنگرەی میدیای ئازاد لەپێناوی عێراقی نوێ، لەهوتێل تاواری هەولێر لە4/29 تاکو 2005/5/27.

- کۆنگرەی چوارەمی یەکێتیی مافپەروەرانی کوردستان_ هەولێر لە27 تا 2004/11/28.

- کۆنگرەی مافپەروەرانی عێراقی (سەنتەری ڕۆشنبیری زانکۆی سەلاحەددین ساڵی 2004)

- کۆنگرەی دەستوورو ڕاپرسی (هەولێر 2005/9/27)

- کۆنگرەی زانستی لەپێناوی گەشەپێدانو چەسپاندنی زمانی کوردی هەولێر 2005/7/15.

- کۆنگرەی یەکەم بۆ دانانی پلانی سترتیژی بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ لەهەرێمی کوردستان ( هەولێر 6/30 تا 2007/7/1)

- کۆنگرەیو ەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی عێراق بۆ هەڵسەنگاندنی خوێندنی مافی مرۆڤ لەهەرێمی

کوردستان (هەولێر، هوتێل هەولێر پلازا لە18/17 تشرینی یەکەم 2012)

- دیداری نێودەوڵەتی ڕۆژنامەنووسان لە2022/4/22 هوتێلی شیراتۆن هەولێر)

- Human Rights Protection Training Agenda (May-2001) Erbil
- Firsr Higher Education Conference In Kurdistan Region – Ireq Erbil 21-23 APRIL 2001
- Conflict Resolution Curriculum Development Workshop University of Duhok 10-14 august 2003

**ئەو ڕێکخراوو کۆمەڵەو دەزگایانەی تیایدا ئەندامە:**

یەکەم: ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان

1-ڕێکخراوی فیدراسیۆنی ئەوروپای عەرەبی بۆ مەشقو ناوبژیوانی نێودەوڵەتی لەکۆماری میسری عەرەبی لەشاری قاهیرە.

2- ڕێکخراوی فیدراسیۆنی ڕۆژنامەنوسانی نێودەوڵەتی (IFJ).

دووەم: ڕێکخراوە ناوخۆییەکان:

1- ڕێکخراوی عێراقی مافی مرۆڤ لەشاری بەغداد.

2- یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان، سەرنووسەری گۆڤاری تەرازووی ئەکادیمی.

3- کۆمەڵەی عێراقی بۆ مافەکانی مرۆڤ لەشاری بەغداد.

4- کۆمەڵە مافخوازانی مافی مرۆڤ لەشاری هەولێر.

5- سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان لەهەرێمی کوردستانی عێراق.

6- یەکێتی نووسەرانی کورد لەهەرێمی کوردستانی عێراق.

7- ڕاوێژکاری میدیا لەگۆڤاری (السیاحة العربیة) لەکۆماری میسری عەرەبی لەشاری قاهیرە.

**ئەو کتابانەی کەدایناون لەبواری ئەدەب و ڕۆشنبیریدا:**

- شەش کورتە چیرۆکی کوردی - هاوبەش، هەولێر چاپخانەی شارەوانی، ساڵی 1976.

- ون بوون - کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر چاپخانەی وەزراەتی ڕۆشنبیری، ساڵی 1984.

- دەرگا - کۆمەڵە چیرۆک، بەغداد چاپخانەی الزمان، ساڵی 1990.

- سەعید زەبۆکی لای خۆمان - رۆمان، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی 1997.

- تڕحێو - کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین ساڵی 2000.

- فەنتازیا- کۆمەڵە چیرۆک ، هەولێر بزاڤی ڕۆشنبیرانی نوێخواز، ساڵی 2010.

- چەندو یسگەیەک ژیانو بیرەوەری، هەولێر چاپخانەی منارە ساڵی 2014.

- بنەماکانی توێژینەوەی زانستی، هەولێر چاپخانەی منارە ساڵی 2009.

- فەلسەفەو یاسا لەچەندو تارێکدا، بڵاوکراوی دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی (O.P.L.C) ساڵی 2005.

- مەملەکەتی ڕۆبۆتەکان_ ڕۆمان، منشورات دار النشر القمأ فی جمهوریه السوریه مدینه دیمشق ساڵی 2020.

- بیرەوەریی جەنگاوەرێک_ ڕۆمان، چاپخانەی تاران ساڵی 2018.

- خانمباز – رۆمان، چاپخانەی منارە لەشاری هەولێر ساڵی 2019.

- حەجو عومرە – رۆمان، چاپخانەی تاران ساڵی 2019 .

- رۆژگارە تاریکو دژوارەکان – رۆمان، چاپخانەی تاران ساڵی 2019 .

- زەبۆکەکەی لای خۆمان- رۆمان – چاپی دووەم، چاپخانەی تاران ساڵی 2020 .

- شەوانی باکۆ – رۆمان، چاپخانەی تاران ساڵی 2020 .

- هونەری منداڵان، چاپخانەی کریستال هەولێر ساڵی 1998.

- دەسەلاتی چوارەم، چاپخانەی وەزراەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ساڵی 1998.

- قرچۆک، ڕۆمان، دەزگای موکریانی بۆ چاپو بلاوکردنەوە، چاپخانەی هێڤی، چاپی یەکەم، ساڵی 2023.

- شەوانی ئێریڤان، ڕۆمان، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، ساڵی 2023.

- ڕۆمانی ژیاننامەیی، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، ساڵی 2023.

- ڕۆمانی سەیرو سەمەرەکانی شێخانی، چاپخانەی دانیشفەڕ، هەولێر، ساڵی 2023.

**ئەو کتێبانەی کەلەبواری یاسادا دایناون:**

- چەمکی یاسا، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین ساڵی 1998.

- هاوسەرگیریو جیابوونەوە، هەولێر چاپخانەی منارە ساڵی 2015.

- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدانی ژمارە 87 ساڵی 1979 ، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر ساڵی 1991.

- حقوق الانسان بەزمانی عەرەبی، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ساڵی 2004 .

- الملكية الفكرية بەزمانی عەرەبی، منشورات دار الدجلة، المملكة الاردنية الهاشمية، عمان ساڵی 2009 .

- حقوق الانسان بين المواثيق الدولية والمذاهب الفكرية بەزمانی عەرەبی، منشورات دار الكتب القانونية فی جمهورية مصر العربية فی القاهرة ساڵی 2010.

- حقوق المؤلف وسلطة الصحافة بەزمانی عەرەبی، منشورات دار الكتب القانونية فی جمهورية مصر العربية فی القاهرة ساڵی 2012.

- حقوق الانسان فی المذاهب الفكرية بەزمانی عەرەبی، بڵاوکراوی دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی (O.P.L.C) ساڵی 2006.

- حقوق الانسان ومعاييرها الدولية بەزمانی عەرەبی، منشورات دار الدجلة، المملكة الاردنية الهاشمية، عمان ساڵی 2010.

- التنظيم الدستوری والدولی لحقوق الانسان بەزمانی عەرەبی، منشورات دار الكتب القانونية فی جمهورية مصر العربية فی القاهرة ساڵی 2017.

- الاطـــار القـــانونی لحريـــة الصـــحافة بەزمـــانی عەرەبـــی، منشـورات دار الكتب القانونيـة فی جمهوريـة مصـر العربيـة فی القاهرة ساڵی 2017.

- دراسات فی القانون العام بەزمانی عەرەبی، منشـورات دار الزين الحقوقية والادبية (ش.م.م) فی لبنـان مدينـة بيـروت سـاڵی 2017.

- فكرة الحق، هەولێر چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین سـاڵی 1998.

- یاســـای دەســـتووری، دەزگـــای موكریـــان بـــۆ چـــاپو بڵاوكردنەوە، چاپخانەی هێڤی، چاپی یەكەم، ساڵی 2022.

- یاسای دەستووری، چاپخانەی تاران، چاپی دووەم، سـاڵی 2023.